"وام زانی فێر دەبم چۆن بژیم، بەڵام فێر دەبووم چۆن بمرم"

لیۆناردۆ داڤنشی

ئەو کاتەی کە هەستی بەوە دەکرد
لە کۆتاییی ژیانی نزیك بووەتەوە.

دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان – هەولێر
هەرێمی كوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیكترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspress.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

ڕەوەند محەمەد جەمیل
لیۆناردۆ داڤنشی
خوێندنەوە و پێداچوونەوەی: عەبدوڵڵا ڕەسووڵ. خالید عوسمان تەها
كتێبی ئاراس ژمارە: ١٢٠٤
چاپی یەكەم ٢٠١١
تیرێژ: ٦٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس – هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان ٢٤٢٠ – ٢٠١١
نەخشاندنی ناوەوە: كارزان عەبدولحەمید
ڕازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەكرەم
هەڵەگری: تریسكە ئەحمەد

## پێڕست

# پەیڤگەلێك بۆ ئەم پەڕتووكە

لە چەندین ملیۆن چەند كەسێك... قوربانییانی لە ژماردن نەهاتووی سەربازانی شەڕ... بە تایبەتیش هەردوو شەڕە گەورەكەی جیهان تەنیا وەك تابووری مردووان و بە زۆریش لە رەنووسێكی قوربانییاندا ناویان دێت... كەچی زەبری كولتووری داهێنان وەك سیمبولێك هەرچەندیش كۆن و هەرە كۆن و دێرین بێت وەك ئەستێرەیەكی گەش لە هزر و بیرەوەریی تاك و كۆمەڵگە جیاوازەكان هەردەم دەدرەوشێتەوە. ئیتاڵیا لە شەڕەكانی دەرەوەی خۆی ناوێكی گەورەی نییە، بگرە دۆڕان و شكستەكانی لە سەركەوتنەكانی زێترن، كەچی باشی بۆ هات و توانی بە باشی رەفتار لەگەڵ ئەو سامانە هزری و مرۆییبە پڕ سەروەرییە بكات، كە لە گریكەوە بۆی بەجێ مابوو. ئیتاڵیا هەر تەنیا ئیمپراتۆریایەكی كارگێڕی و سیاسی نەبوو، بگرە ئیمپراتۆریای ئەدەب و هونەریش بوو. بەو پێیەی دامەزرێنەر و داهێنەری كورتە چیرۆك و پەیكەرتاشی و تەلارسازی و چەندین جۆر و ستایلی تری كولتووری بوو. هەر بۆیەش كە ناوی رێنیسانس دێت ناوی ئیتاڵیاش بە درەوشاوەیی دێت بە تایبەتیش ناوی هونەرمەندە گەورەكانی وەك لیۆناردۆ داڤنشی و مایكل ئەنجیلۆ و رافائیل و چەندین و چەندینی تر.

ئەم پەڕتووكەی بەردەستتان (لیۆناردۆ داڤنشی – سیمبولی بلیمەتی) هەڵبژاردنێكی راست و دروست و پێویستی هاوڕێی روح سووك و نووسیاری پڕ خواستم (رەوەند محەمەد جەمیل)ە و بە زمانێكی رەوانی كوردی نووسیویەتی و تا رادەیەكی باشیش دەسەڵاتی بەسەر دەربڕیندا شكاوە و لە رێگەی ئەم زمانە روونەوە باس لە پانۆرامای ژیان و بەرهەمەكانی داڤنشی دەكات. ئەوەی كە لەم پەڕتووكەدا جێی بایەخە ئەوەیە ئێمە لە كەمیی خوێندنەوەمان داڤنشیمان تەنیا وەك شێوەكار ناسیوە، بە تایبەتیش وەك ئەفرێنەری تابلۆ پڕ بەهاكەی (مۆنالیزا)، كەچی ئەگەر ئەم پەڕتووكە بخوێنیتەوە بۆت دەردەكەوێ، كە لیۆناردۆ داڤنشی موزیكژەن و ئەندازیار و زانا و ژیربێژ و جەنەراڵی سەربازی و هی تریش بووە.

لەم پەڕتووكەدا هاتووە، كە داڤنشی كەسایەتییەكی بێهێزی هەبووە و نەیتوانیوە

داواکانی دەسەڵاتداران ڕەت بکاتەوە.. کە ڕەنگە ئەمەیان لای خوێنەری خاوەن ویژدان و هەڵوێست دڵەڕاوکێ و گومان دروست بکات.. بەڵام هەرگیز لە پایەی بەرزی هونەریی ئەو دانابەزێت، بەو پێیەی ئەویش کوڕی نەریتی سەردەمی خۆی بووە و دەبووایە دەسەڵاتدارێك پشتگیری لە هونەرمەندان بکات، ئەگینا لە قاوغی خۆیان وشك دەبوونەوە.

ئەگەرچی داڤنشی خۆپەرست بووە و حەزی لە پلە و پایە و ناوبانگ بووە، کەچی هەروەك لەم پەڕتووکەی (ڕەوەند محەمەد جەمیل)دا هاتووە لیۆناردۆ ئەو مافەی بە خۆی نەدەدا ژیان لە ئاژەڵ بسەنێتەوە. بۆیە گۆشتی نەدەخوارد و کە باڵندەشی دەکڕی، پاشان دەیفڕاند.. هەروەها (لیۆناردۆ) پڕۆتێستی شەڕ و ڕژانی خوێنی دەکرد و مرۆڤیشی بە پادشای ئاژەڵان و بگرە بە دڕندەترین ئاژەڵ دادەنا، بەڵام ئەو بیروڕایەی ڕێگر نەبوو لەوەی بە دوای تاوانبار و تۆمەتبارانداا بڕوات کە بە ملپەڕێن (المقصلە) دەکوژران. ئەوەش بۆ لێکۆڵینەوە بوو لە ڕووە ترساوەکانیان، کە لیۆناردۆ لەو کاتەدا سکێچیانی دروست دەکرد.

دەکرێ مرۆڤ بەراوردێك لە نێوان ئەم هەڵوێستەی لیۆناردۆ لەگەڵ هەڵوێستێکی لێوانلێو لە مرۆڤایەتی و ویژدان و هەستی بەرزی ئەدیب و فەیلەسووفی فرەنسایی (ئەلبێر کامۆ) بکات کە لە پەڕتووکی (ملپەڕێن – المقصلە)دا دەیەوێ بە خوێنەری بڵێت، مافی ژیان سەندنەوە لە تاوانبارێکی دڕندە، کە مەترسیی بۆ سەر خەڵك هەیە ڕەوایە، بەڵام کوشتنی تاوانبار وەك جێبەجێکردنی سزای دادگە بە مەقسەلە و بەو شێوە قێزەوەن و دڕندانەیە، کارێکی نامرۆڤانە و ناڕەوایە.

دواجار دەمەوێ بڵێم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لیۆناردۆ داڤنشی پێشەنگی ئەندێشە و هونەری جوانە و هەرگیز ناکرێ نکوڵی لە بەها و شاکارێتیی دوو کاری گەورەی وەك تابلۆی (مۆنالیزا) و (پاکیزەی ناو تاشەبەردان) بکرێ.

لە دوا دێری ئەم نووسینەشمدا بە (ڕەوەند محەمەد جەمیل)ی نووسیاری ئەم پەڕتووکە دەڵێم کارێکی باشت کرد تەندروست بیت و هاوشێوەت زۆر بێت.

خالید عوسمان تەها

هەولێر – ٢٠١٠/٨/١٨

# پێشەکی

سەردەمی ڕێنیسانس کە لە نێوان سەدەکانی سێزدە و چواردەدا سەری هەڵدا و تاوەکو سەدەی شازدە درێژەی کێشا. لەو ماوەیەشدا جگە لە چەندین هونەرمەندی بە توانا، هونەرمەندێکی بلیمەت بە ناوی (لیۆناردۆ داڤنشی) ناوی بریسکەی دایەوە و بووە ڕابەری هونەری شێوەکاریی سەردەمی ڕێنیسانسی ئەوروپایی. ئەوەش بە هۆی ئەو داهێنانە مەزنانەی کە لیۆناردۆ لە بواری هونەردا ئەنجامی دان.

تاوەکو ئێستاش بەرهەمە شێوەکارییەکانی لیۆناردۆ بەوپەڕی شکۆدارییەوە لەلایان ڕەخنەگران و هونەرمەندان و جەماوەری هونەردۆستەوە سەیر دەکرێن، بلیمەتیی لیۆناردۆ داڤنشی تەنیا لە هونەرەوە نەبوو، بگرە لە زۆربەی بوارەکانی زانست و زانیاریدا زیرەکییەکی بێ وێنەی نواند. لیۆناردۆ داڤنشی لە بواری ئەندازیاریدا زۆر کارامە بوو، داهێنەری چەکە کوشندەکان بوو، لە هەمان کاتیشدا دیزاینی چەندین کەرەستەی پیشەسازیی دانا، بنەمای شێوە زانستییەکانی توێکاریی دەستنیشان کرد و شارەزاییییەکی زۆر باشیشی لە ڕووەك و سروشتدا هەبوو، زانستی ماتماتیکی سەردەمەکەشی دەزانی، لە بوارەکانی کشتوکاڵ و دروستکردنی بەنداو لەسەر ڕووبارەکان، دروستکردنی جۆگە بۆ ئاودان و وشککردنی گۆماوەکانی بە شێوەیەکی پراکتیکی جێبەجێ کرد، لە بواری فڕینیشدا تاقیکردنەوەی زۆری ئەنجام دا. سەرەڕای ئەمانەش لیۆناردۆ ژیربێژ و مۆزیکژەن و پەیکەرتاشیش بوو.

ڕێنیسانس ماوەیەکی زۆر گرینگە لە مێژووی وڵاتەکانی ئەوروپا، بۆیە زەحمەتە مێژوو یان ساڵێکی دیاریکراوی تەواو بۆ ڕێنیسانس دابنێین، لەبەرئەوەی لە وڵاتی جیاجیادا ڕێنیسانس هاتە کایەوە، بە شێوەیەك کە مێژووی سەرهەڵدانی ڕێنیسانس لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاواز بوو. بۆیە لە کاتی جیاوازدا لە ناوچەکانی پارزەوینی ئەوروپا بڵاو بووەوە. بەڵام سەرەتای دەستپێکردنی سەردەمی ڕێنیسانس لە ئیتاڵیا سەری هەڵدا، پاشان لە سەرجەم ئەوروپا بڵاو بووەوە.

ڕێنیسانس لە ئەنجامی کاریگەری پێداویستییەکانی ژیانەوە سەری هەڵدا کە ڕۆژ بەڕۆژ جیهان زیاتر پێویستی بە پێشکەوتن دەبوو و پێشکەوتنی زیاتری بە خۆیەوە

دەبینی، کەچی پیاوانی ئاینی کڵێساکان رۆژ بەرۆژ خوازیاری وەدەستهێنانی دەسەڵاتی زیاتر بوون بۆ خۆیان بەبێ گوێدانە پێداویستیی ژیانی خەڵك بۆ پێشکەوتن. بەو شێوەیەش گەرەلاوژەیەکی زۆر کەوتە نێوان کۆمەڵگەکان. لە ئەنجامی ئەو فاکتەرانە دوو کەسایەتیی ریفۆرمخواز بە ناوی (مارتن لۆسەر) و (جۆن کالفین) لە وڵاتەکانی نزیك باکوری چیاکانی ئەلب، لەژێر دەسەڵات و فەرمانرەواییی (پاپا) دەچنە دەرەوە و کڵێسایەکی تایبەت دادەمەزرێنن، کە لەو کاتەوە بە کڵێسای پرۆتستانتی دەناسرێت، کە ئەو ناوەش بە مانای نارەزایی دێت. پرۆتستانتەکان لایەنگرێکی زۆر لە خۆیان کۆ دەکەنەوە، کە ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ مرۆڤایەتی بەپێی زانیارییە نوێیەکەی ئەو سەردەم لەنێو بیروباوەریدا پێویستی بە چاکسازی بوو.

پاشان کارەسات و ئاژاوەی زۆر لە نێوان لایەنگرانی پاپا و پرۆتستانتەکان رووی دا بەڵام رۆژ بەرۆژ ژمارەی پرۆتستانتەکان زیاتر دەبوو و خەڵکیش زیاتر متمانەیان بە پیاوانی ئاینی نەدەما. لەنێو ئەو پشێوی و ئاژاوانەدا بە شێوەیەکی پچرپچر لە سەدەکانی سەردەمی رێنیسانسدا زۆر لە زانا و هونەرمەندی بلیمەت و مەزن لە بوارەکانی زانست و هونەر و ئەدەب داهێنانی زۆر گەورەیان ئەنجام دا، بەو شێوەیەش رێنیسانس بەهیچ شێوەیەك نەوەستا. تا لە سەدەی شازدەدا سەرجەم ئەو لەمپەرانەی کڵێسا و داوونەریت لە بەردەم پێشکەوتنە زانستییەکان لاچوون.

لە بواری هونەری شێوەکاریشدا لە نێوان سەدەکانی پازدە و شازدەدا سێ لە هونەرمەندانی گەورە و بەناوبانگ لەسەر ئاستی جیهانی لەدایك دەبن کە هونەرمەندان (لیۆناردۆ داڤنشی) و (مایکل ئەنجیلۆ) و (رافائیل سانزیۆ) بوو. بەڵام لیۆناردۆ جیا لە هونەرمەندەکانی تر پایەیەکی مەزنتری هەبوو، لەبەرئەوەی توانی بگاتە ئەو ئاستەی کە لە زۆربەی بوارەکاندا زانا بێت، تا ئاستێك کە هیچ کەسێك لە مێژووی مرۆڤایەتیدا پێی نەگات.

لیۆناردۆ لە ناوەراستی سەردەمی رێنیسانسی ئیتاڵیایی لەدایك بووبوو. دەتوانین بڵێین لیۆناردۆ بەشێکی ئەو رێنیسانسەی ئیتاڵیایی بووە، بۆیە زەحمەتە بریاری ئەوە بدەین کەوا بلیمەتیی لیۆناردۆ لە ئەنجامی کاریگەرییەکانی ئەو سەردەم بووە. بەڵام دەتوانم بڵێم لیۆناردۆ هەنگاوێکی تری رێنیسانسی خستە سەر رێگەی ریفۆرم لە هونەر و زانست و هزردا.

(ئەزڤاڵد شپینگلەر)[*] کە نووسیاری (دواکەوتنی شارستانیەتی رۆژئاوا)یە، ژیریی لیۆناردۆ داڤنشی وا پۆلێن دەکات کە مەزنترین تێڕامانی تەواوی هەیە، قووڵیی تێڕامانی لیۆناردۆ بۆ ئەو تێبینییە زانستییانەی دەگەڕێنێتەوە کە تێکەڵاو بووبوو لەگەڵ فەلسەفە و کاریگەری بەسەریدا هەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لیۆناردۆی بلیمەت زانست و زانیارییەکانی لە زانکۆ و کۆلێجەکاندا فێر نەبووبوو، بگرە هەر خۆی کەسایەتییەکی وای هەبوو کە بگەڕێت بە دوای سەرچاوە و دروستبوون و چارەسەرکردنی کێشەکان، سەرەڕای هەموو ئەو بەرهەمانەش لیۆناردۆ داڤنشی لە سەردەمێکدا ژیاوە کە نەزانی باڵی بەسەر کۆمەڵگەکاندا کێشابوو.

---

(*) (علی/ ص١).

بەشی یەکەم

## لەدایکبوونی بلیمەتێکی مێژووی مرۆڤایەتی

لە ساڵی ١٤٥١ و لە ڕۆژێکی بەهاردا (پییێرۆ ئەنتۆنیۆ داڤنشی) لە فلۆرانساوە دەگەڕێتەوە بۆ شارۆکەی (ڤنشی) کە بنەماڵەکەی تێیدا دەژیا و شوێنی لەدایکبوونیشی بوو. (پییێرۆ داڤنشی) کە پیشەی دادنووسیی دەکرد، لەسەر داوای چەند کەسێکی خەڵکی شارۆکەکەی دەگەڕێتەوە ڤنشی بۆ ڕێکخستنی چەند بەڵێننامەیەکی یاسایی. پاش تەواوکردنی بەڵێننامەکان هەندێك لە پیاوانی شارۆکەی ڤنشی بانگهێشتنی (پییێرۆ) دەکەن بۆ مەی خواردنەوە لە بارێکی گوندی (کامبۆ دێلا تۆراتسیا) کە گوندێکی دەوروبەری شارۆکەی ڤنشی بوو. پییێرۆ پاش ئەوەی بە بانگهێشتنەکەیان ڕازی دەبێت، دەچێتە گوندەکە. لە بارەکەشدا کچێك بە ناوی (کاترینا) خزمەتیانی دەکرد کە کچێکی جوان و هەتیوو بوو و لە سەرەتای گەنجێتیشیدا بوو. پییێرۆ هەرکە کاترینا دەبینێت تەواو شەیدای دەبێت، پاش هەوڵدانێکی زۆری پییێرۆ بۆ ماوەی ساڵێك پێوەندیی لەگەڵ دەبەستێت[١].

سەعات سێی پاش نیوەڕۆی ١٥ی ئەپریلی ساڵی ١٤٥٢ لە دەوروبەری شارۆکەی (ڤنشی) نزیك فلۆرانسا لە کەرتی تۆسکانیا[٢]، لە ئەنجامی پێوەندییەکی ناشەرعیی نێوان (کاترینا) و (پییێرۆ ئەنتۆنیۆ داڤنشی) لیۆناردۆ لەدایك دەبێت. ساڵی لەدایکبوونی لیۆناردۆ کۆتای سەردەمی سەدەکانی ناوەڕاست بوو[٣].

بەڵام بە هۆی ئەوەی باوکی لیۆناردۆ فەرمانبەرێکی ناسراو بوو، لە بنەماڵەیەکی پایەبەرز و بەڕێزیش بوو، دانی بە باوکایەتیی خۆی دانەنا کە لیۆناردۆ کوڕی بێت. بۆیە لیۆناردۆ نزیکەی پێنج ساڵ لەلای دایکی مایەوە. هەر لە بەهاری هەمان ساڵیشدا باوکی پییێرۆ کچی بنەماڵەیەکی بەناوبانگی بۆ پییێرۆ خواست کە ناوی (پییێرا دێ جیۆڤانی) بوو

(١) (یوسف/ ص٣٠)

(٢) (الناجحون/ ص١٠. دافنشی/ ص٢١)

(٣) (علی/ ص١)

کە کچێکی بچووك نەبوو، بەڵام لە بنەماڵەیەکی بەڕێز و دەوڵەمەند بوو[٤].

باوکی (پییێرۆ) مێردێك بۆ (کاترینا)ش دەبینێتەوە کە کرێکارێکی ڕۆژانە و هەژار بوو، ناوی (ئەکاتا بریجا دێ پیترۆ دێل فاکا) بوو کە پیاوێکی بەردەوام مەست بوو. بەرامبەر بە برێك پارە و پارچەیەك زەوی رازی دەبێت بەوەی کاترینا ببێتە ژنی.

بە هۆی ئەوەی باوکی لیۆناردۆ منداڵی لە (پییێرا) نەدەبوو، ناچار بوو کەوا دان بەوە بنێت کە لیۆناردۆ کوڕیتی و داوای بکات، بۆیە لیۆناردۆ پاش پێنج ساڵ لە دایکی دوور خرایەوە و درایە دەستی زڕدایکە نەزۆکەکەی.

لیۆناردۆ پێشتر لە ماڵی دایکی بە هۆی هەژاری و کلۆڵی و دووری لە باوکییەوە ژیانێکی سەخت و پڕ چەرمەسەریی بەسەر بردبوو، بۆیە هەر لەبەر ئەو فاکتەرانە لە ژیانیدا هەستی بە دڵنیایی نەدەکرد. بەڵام لیۆناردۆ لە ماڵی باوکی لە باوەشی (ئەنتۆنیۆ)ی باپیری و (مۆنا لۆتشیا دێ پیترۆ زۆدزێ)ی داپیریدا کە زۆر خۆشی دەویست[٥]... هەستی بەوە کرد وەکو مرۆڤ سەیر دەکرێت. لەبەرئەوەی یەکەمین کاری باش کە هەر زوو باپیری پێی هەستا بەر لەوەی بینێرێتە قوتابخانە ئەوە بوو لە کڵێسا لیۆناردۆ مۆر (تعمید)ی کرد و کردی بە کریستیان و بەفەرمی کردییە کەسێکی بنەماڵەکەی[٦].

لیۆناردۆ داڤنشی لە تەمەنی حەفت ساڵیدا چووە بەر قوتابخانە، لە ماوەیەکی زۆر کورتیشدا نیشانەکانی بلیمەتی لە گشت بابەتەکانی قوتابخانە لە لیۆناردۆ ڕەنگی دایەوە، واتە لە قوتابییەکانی تر زیرەکتر بووە هەر بۆیەشە لیۆناردۆ پاش بیرکردنەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا قوتابخانە بەجێ بهێڵێت. لیۆناردۆ پاش دوورکەوتنەوە لە قوتابخانە ڕۆژانە کاتەکانی خۆی لەنێو کێڵگە و گردەکانی دەوروبەری شارۆکەکەی بەسەردەبرد. هۆکاری دوورکەوتنەوەی لیۆناردۆ لە قوتابخانە لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بووبێت ئەو قوتابخانەیەی کە لیۆناردۆ تێیدا دەیخوێند لە ئاستێکی مامناوەندی بووبێت. لەبەرئەوەی قوتابخانەی شارێکی گەورە نەبوو، لەگەڵ ئاستی بلیمەتی و زانیاریی لیۆناردۆ نەدەگونجا[٧].

(٤) (فروید/ ص٦).

(٥) (یوسف/ ص٣١)

(٦) (علی/ ص١).

(٧) (هان/ص٧).

بەڵام لیۆناردۆ قوتابییەکی هێمن و ڕێکوپێکیش نەبوو لە خوێندنیدا، لەبەرئەوەی بابەتەکانی لاتینی و وەرزش و ئەدەبی پشتگوێ خستبوو. بۆیە لیۆناردۆ وای پێ باش بوو بە شێواز و پێوەری خێراییی تایبەتیی خۆی شتەکان فێر ببێت.

لیۆناردۆ پاش ئەوەی کە قوتابخانە بەجێ دەهێڵێت دەچێتە سەر گرد و دەشت و نزیك رووبارەکان. واتە چووە نێو ژینگەی سروشت کە چەندین جۆرە رووەك و ئاژەڵ و زیندەوەری جیاوازی لێ بوو، لیۆناردۆ سروشتی بە قوتابخانەیەکی نوێی جیاواز لە قوتابخانەی پێشتری دانا کە لەو قوتابخانە بەرفراوانە دەتوانێت تا ئاستێکی زۆر زیاتر وەڵامی ئەو پرسیارانەی بدرێتەوە کە لە قوتابخانەی ئاساییی پێشتریدا بێ وەڵام بوون. بۆیە لیۆناردۆ بۆ کۆکردنەوەی ماسی و زیندەوەری بچووك، زۆر دەچووە سەر تەپۆڵکە بەردینەکانی دەوروبەری خانووەکەیان و هەر لە هەمان کاتیشدا چاودێریی ڕێڕەوی جۆگەکان و شێوەی فڕینی باڵندەکانیشی دەکرد. هەر بۆیەشە پاشان سروشت کاریگەری بەسەر زۆربەی کارەکانی لیۆناردۆوە دەبێت، بە تایبەتیش کارە هونەرییەکانی لەبەرئەوەی لیۆناردۆ بەردەوام پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە سروشت بۆتەی گشت زانیارییەکانە و لە هەمان کاتیشدا مەیدانی سەرەکیی داهێنانی نیگارکێشانە، داوای لە هونەرمەندانیش دەکرد لە پێناو داهێنانێکی هونەری ڕەسەندا زانستی ڕاستەقینە فێر ببن(٨).

لیۆناردۆ داڤنشی بە هۆی ئەوەی کەوا ڕووەك و زیندەوەر و گیانەوەرەکانی سروشت بوونە جێگەی تێڕامانی بۆیە هەڵسا بەهێڵکاری و وێنەکێشانیان، ئەو هێڵکاری و وێنانەی کە لیۆناردۆ کێشابووی هەر زوو سەرنجی باوکی ڕاکێشا. لەگەڵ ئەوەشدا کە باوکی لیۆناردۆ تێڕوانینێکی تایبەتی نەبوو بۆ لیۆناردۆ، بگرە گرینگترین شت لەلای ئەوە بوو کە کوڕەکەی پیشەیەك فێر ببێت کە پارەیەکی کەمی تێ بچێت.

بۆیە باوکی لیۆناردۆ وێنەکانی لە لیۆناردۆ سەند و بردیە لای (ئەندریا دێل ڤیروکیۆ) کە وێنەکێشێکی ناوداری ئەو سەردەم بوو لە فلۆرانسا. ڤیروکیۆ کە وێنەکانی لیۆناردۆی بینی زۆر پێی باش بوو، داواشی لە باوکی لیۆناردۆ کرد کە زۆر پێی خۆشە لیۆناردۆی بۆ بنێرێ، تاوەکو لەلای ببێتە قوتابی(٩).

(٨) (مەزهەر/ل ٩٣).

(٩) (هان/ ص١٧).

## لیۆناردۆ دەچێتە فلۆرانسا
## دەبێتە یەکێك لە قوتابییەکانی ڤیروکیۆ

لیۆناردۆ لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بۆ یەکەم جار بوو چووە فلۆرانسا تاوەکو لەلای ڤیروکیۆ ببێتە قوتابی. دواتریش لە ساڵی ١٤٦٨ پاش ئەوەی کە (ئەنتۆنیۆ داڤنشی) باپیری لیۆناردۆ دەمرێت، پاشان لە ساڵی ١٤٦٩یش (پیێرا)ی زڕدایکەکەشی دەمرێت. بەیەکجارەکی ماڵی باوکی لە شارۆکەی (ڤنشی) دەگوازنەوە بۆ فلۆرانسا. پاشان باوکی لیۆناردۆ ژنێکی تر بە ناوی (فرانچیسکا لانفریدینی) دەهێنێت، کوڕێکی لێی دەبێت بە ناوی (ئەنتۆنیۆ).

(ڤیروکیۆ) لە بنچینەدا زێڕنگەر و پەیکەرتاش و وێنەکێش بوو، مامۆستایەکی شارەزا و هونەرمەندێکی بلیمەت و بەناوبانگی فلۆرانسا بوو لە بواری هونەری شێوەکاریدا. بۆیە لیۆناردۆ لە ستۆدیۆکەی ڤیروکیۆدا بۆ یەکەم جار بوو هەستی بەوە کرد کەوا لە جێگەیەکی شیاوە، لەبەرئەوەی لەگەڵ قوتابییەکان و هاوڕێکانیدا سەرجەم کاتەکانیان بە کاری هونەرییەوە بەسەردەبرد. ڤیروکیۆ زۆر بە پەرۆش بوو بۆ کارکردن، بۆیە قوتابییەکانی لاساییان دەکردەوە. سەرەتای کارکردنی قوتابییەکانی ڤیروکیۆ تەنیا (سکێچ) نەبوو، وەکو خوێندنگەکانی هونەرە جوانەکانی ئەم سەردەمە، هەر ئەوە نەبوو تەنیا هەندێك دیمەنی سروشتی دروست بکەن، بگرە قوتابییەکانی ڤیروکیۆ دەبایە شتی زیاتر لە رەنگکردنی تابلۆ و سواخکردنی پەیکەرەکان بەقوڕ بخوێنن و فێر ببن، وەکو دروستکردنی خودی رەنگەکان و پەیکەرەکانیش.

رەنگەکانی وێنەکێشان تاوەکو سەردەمی لیۆناردۆش لەسەر بنەڕەتی ئاوی بوونە، پێی دەگوترا (تەمپەرا) کە زوو لادەچوو، بۆیە هونەرمەندانی ئەو کات هەوڵیان دەدا رەنگەکانیان لەگەڵ رۆنی شلی جۆرەوجۆر تێکەڵاو بکەن، لەبەرئەوەی گەیشتبوونە ئەو ئەنجامەی کە رۆن رەنگ و بریسکەی کارە هونەرییەکانیان دەپارێزێت.

جگە لەوەش هونەرمەندەکان لەو سەردەمدا بە هۆی داهێنان و بەکارهێنانی (روانگە) لەنێو تابلۆ هونەرییەکانیان سەدان کێشەی جۆرەوجۆریان کەوتە پێش کە دەیانویست چارەسەری بکەن. ڤیروکیۆ سەرەڕای سەرقاڵبوونێکی زۆر بە

کاروبارەکانی نێو ستۆدیۆکەی، ئەوا هەر لە هەمان کاتیشدا وەکو زۆربەی خەڵکی فلۆرانسا بایەخێکی ئێجگار زۆریشی بە خوێندنی ماتماتیکی نوێی سەردەمەکەشی دەدا. ماتماتیك بۆ هونەرمەند گرینگییەکی تایبەتی هەبوو لەبەرئەوەی بە هۆی هەوڵی بەکارهێنانی روانگە لەنێو دیمەنە کەتوارەکان هونەرمەندانی وێنەکێش دەبایە ماتماتیك بزانن. ڤیروکیۆ زانیارییەکی ئەوتۆشی لەسەر ئەندازە نەبوو، بەڵام سووریش بوو لەسەر فێربوونی ئەندازە.

لیۆناردۆ لە ڤیروکیۆ فێر بوو گرینگییەکی زۆر بە خوێندنەوە بدات، بۆیە هەر شتێکی بکەوتبایە بەردەست دەیخوێندەوە وەکو زانستی پزیشکی و ئەستێرەناسی و جیۆلۆجیا و چۆنیەتیی دروستکردن و بەکارهێنانی ئامێرە جۆرەوجۆرەکان. کاتێك لیۆناردۆ لەسەر (بەرد) هەندێك زانیاریی خوێندەوە یادگارییەکانی خۆی لە شارۆکەی ڤنشی بەبیر هاتەوە، لەبەرئەوەی لە شارۆکەکەی سەری لەوە سوورمابوو چۆن گوێچکە شەیتانۆکە و ئێسکی ماسی گەیشتوونەتە ناو ناخی تاشەبەردەکانی تەپۆڵکەکانی دەوروبەریماڵەکەیان. بۆیە لە ئەنجامدا بە هۆی خوێندنەوە تێ گەیشت کە چۆن گوێچکە شەیتانۆکە و ئێسکی ماسی چوونەتە نێو ناخی بەردەکان.

پاش دەستکەوتنی ئەو زانیارییە لیۆناردۆ لە پەراوی تێبینییەکانیدا نووسی: چەند لە پادشا و خەڵك و گۆڕانکاری لە وڵاتاندا، چەند رووداو تێپەڕ بوون تاوەکو لە ئەنجامدا ئەو ماسییە بەو شێوە سەرسووڕهێنەرە لەنێو قووڵاییی ئەو ئەشکەفتە تاریکە بەو شێوە گەیشتووە[١٠].

مرۆڤ لە روانگەی (ئەدلەر) خودێکی ئەفرێنەری هەیە، واتە شێوەیەك لە (من)ی زگماکی، هەر لە کاتی تەمەنی بچووکیدا ئەوا ئەو (من)ە زگماکە وای لێ دەکات لە جیهان بگات و بگەڕێت بە دوای شارەزابوونی شتی نوێتر، لەگەڵ ئەو شتانەی کە فێری دەبێت، لەگەڵ ئەو زانیارییە خودییانەی کە پێشتر دەیزانی شێوەیەك لە ژیان فێر دەبێت، واتە میتۆدێکی شێوە جیاواز لە مامەڵەکردن لەگەڵ جیهانی پێشکەوتوو کە لەگەڵ بەرەنجامی رووناکییە نوێیەکان بێت[١١].

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمە سەدان ساڵ لە لیۆناردۆ دووریـن، بەڵام ئەوەمان بۆ دەسەلمێ کە لیۆناردۆ لە بیر و بۆچوونەکانیدا چەندە رەهەندی جۆرەوجۆری هەیە و تا

(١١) (فونتانا/ ص٧٧).

چ ئاستێکیش تامەزرۆی زانین بووە. ئەو کارە هونەرییانەی کە ڤیروکیۆ بە لیۆناردۆی دەسپارد، لیۆناردۆ بە ئاستێکی هونەری زۆر بەرز ئەنجامی دەدان بەمەش سەرنجی ڤیروکیۆی بۆ خۆی راکێشا، کە لە ئەنجامدا ڤیروکیۆ زۆر پرۆژەی هونەریی تری پێ سپارد. بۆیە لیۆناردۆ لە نێوان سالانی (١٤٦٩- ١٤٧٨) دەبێتە یاریدەری مامۆستاکەی، لەو ماوەیەشدا تواناکانی خۆی لە بواری شێوەکاری دەردەبڕێت کە لە ڤیروکیۆ بە تواناترە ئەوەش بە تایبەتی پاش ئەوەی ئەو فریشتەیەی نێو تابلۆی (مۆرکردنی پێغەمبەر - تعمید المسیح) دروست دەکات[١٢].

لیۆناردۆ پاش ئەوەی کە فریشتەی لای چەپی نێو تابلۆکەی مۆرکردنی پێغەمبەر عیسای کێشا، ڤیروکیۆ سوێندی خوارد کە چیی تر وێنە نەکێشێت، بگرە تەنیا کاری پەیکەرتاشی بکات. لەگەڵ ئەوەشدا کە تابلۆکە بە تەواوی تەواو نەکرا، بەلام زۆر بە ڕوونی دیارە کە دوو دەستی جیاواز کاریان لەو تابلۆیەدا کردووە. بە هۆی ئەو کارە ڤیروکیۆ هونەری وێنەکێشان بەجێ دەهێڵێت و تا لە ژیان دەمێنێت تەنیا خەریکی داتاشین دەبێت[١٣].

بەلام جێهێشتن و دەست لە کار هەڵگرتنی ڤیروکیۆ لە وێنەکێشان لە بۆچوونێکی تردا دەڵێت ئەوە وەکو ئەفسانە وایە کە پاش مردنی لیۆناردۆ دروست کرابێت، لەبەرئەوەی ڤیروکیۆ پاش تابلۆی (مۆرکردنی پێغەمبەر عیسا) چەندین تابلۆی تریش دروست دەکات[١٤].

مۆرکردن یان بوون بە کریستیان کاریگەری لەسەر لیۆناردۆوە هەبوو، لەبەرئەوەی پێشتریش هەروەکو گوتمان لیۆناردۆ بۆ یەکەم جار کە هەستی بەوەکرد وەکو مرۆڤ سەیر دەکرێت ئەو کاتە بوو کە باپیری لە کڵێسا مۆری کرد و کردی بە کریستیان و بە فەرمی کردییە کەسێکی نێو بنەماڵەکەی. ئێستاش پاش دروستکردنی تابلۆی (مۆرکردنی پێغەمبەر عیسا) لیۆناردۆ لە تەمەنی بیست ساڵی واتە لە ساڵی ١٤٧٢ بە هۆی کارکردن لەو تابلۆیە بە شێوەیەکی فەرمی دەبێتە ئەندامی یەکەتیی هونەرمەندانی فلۆرانسا. ئەمەش لە تۆماری (سان لۆکا) بۆ پیشە و هونەر لە فلۆرانسا

(١٢) (علام/ص٨٦).
(١٣) (بیتر- موری /ص١٩٣).
(١٤) (دیورانت/ ص٢٥٢).

تۆمارکراوە(١٥).

لێرەدا لەلای لیۆناردۆ (مۆرکردن – بە کریستیانیبوون) ئەو بۆچوونەی بۆ دروست کرد کە پاساوێك بێت بۆ بوون بە مرۆڤ و هونەرمەند.

لیۆناردۆ لە ستۆدیۆکەی ڤیروکیۆی مامۆستایدا زۆر کاری کرد، زۆریش دڵخۆش بوو بە کارەکانی. بۆیە ئەو ماوە دیاریکراوەی کە بۆی داندرابوو بۆ فێربوون لەلای ڤیروکیۆ زیاتر لە ماوەی دەستنیشانکراو مایەوە، لەبەرئەوەی تا تەمەنی بیست و شەش ساڵی لە ستۆدیۆکەی ڤیروکیۆ دەمێنێتەوە. لەو ماوەیەش لیۆناردۆ هەروەکو مامۆستاکەی و ئەو فێرخوازانەشی کە لەگەڵیدا بوون بەهۆی شەیدابوونیان بۆ زانین و شارەزابوون کارەکانیان ئەنجام دەدا. بۆیە لیۆناردۆ هەردەم باوەشی کرابووەوە بۆ وەرگرتنی ئەزموونی زیاتر لە شێوازی نوێ. لیۆناردۆ فێر بوو کە چۆن لە دەرەوە و ژوورەوە بنمێچەکان بە یەکەوە جوانکاری بکات، جگە لەوەش هەموو رێگە جۆرەوجۆرەکانی ئەنجامدانی پیشەکەی فێر بوو و چەند نوێکارییەکیشی تێدا کرد.



نەخشکردنی بنمیچ                لیۆناردۆ داڤنشی

(١٥) (دافنشی/ص٢٢).



تابلۆی (مۆرکردنی عیسا) دەستکردی هەردوو هونەرمەند (ڤیروکیۆ، لیۆناردۆ)، ڕەنگی ڕۆنی شل و تەمپەرا لەسەر دار، ″١٤٧٢– ١٤٧٣″، ١٧٧×١٥١سم، فلۆرانسا ـ گەلەری ئۆفیزی.



بەشێك لە تابلۆی (مۆرکردنی عیسا)

(هـیـگـل) لـە کـتـێـبـی ئـیـسـتـاتـیـکـا ئـامـاژە بـەوە دەکـات لـە ساڵـی ١٤٧٣ تـوخـمـە سەرەکییـەکـانـی هـونـەری لیـۆنـاردۆ هـەر زوو وەکـو تـایـبـەتمـەندییەك بەدەردەکەوێت، ئەوەش بـەوەی کە گرینگی بە نزیکیی نێوان سێبەر و رووناکی دەدات(١٦).

تـابـلـۆی (پـاکـیـزەی سەهـۆڵان) کـە لیـۆنـاردۆ لـە ساڵـی ١٤٧٣ ئـەنجامـی دابـوو بـە یەکەمین تابلۆی سەلمێنراوی دەستکردی لیۆناردۆ دادەنرێت، بۆیە لەو تابلۆیەدا بە ڕوونـی دەردەکـەوێت کـە لـیـۆنـاردۆ پێشەنگی سەردەمـەکـەی بـووە، بـە تـایـبـەتیش لـە باگراوندی دیمەنی تابلۆکە کە دیمەنێکی سروشتییە. تابلۆی (مزگێنی)یش یەکێك بوو لـەو کـارە هـونـەریـیـانـەی کـە لـیـۆنـاردۆ لـە ساڵـی ١٤٧٣ کێشابـووی بـەر لـەوەی بـە یەکجاری ستۆدیۆکەی ڤیروکیۆ بەجێ بهێڵێت، کە ئێستا ئەو تابلۆیە لە مۆزەخانەی (ئـۆفـیـزی)یـە لـە فـلـۆرانسا. لـە ٥ی ئـۆگستـی ساڵـی ١٤٧٣شدا ئـەوجـارەیـان لیـۆنـاردۆ لـەسەر تـابـلـۆیـەکـی دیمەنـی سروشتـیـدا بـە دەستـی چـەپـەی نـاوی بـە پـێـچـەوانـە دەنووسێتەوە. شایانی باسکردنیشە لیۆناردۆ هەر چۆن دەیتوانی دەستی چەپەی بۆ نووسینەوە و کارە هونەرییەکانی بەکار بهێنێت، بە هەمـان شێوەش دەیتوانی دەستی راستـەش بـەکـار بـهێنێت. لیـۆنـاردۆ پـاشـان سەرجـەم تێبـیـنـی و لێکـۆڵـیـنـەوەکـانـی بـە پـێـچـەوانـە نـووسـیـیـەوە. بـەڵام بـۆچـوونـێـکـی تـر دەڵـێت: لـیـۆنـاردۆ وێـنـەکـێشان و نـووسیـنـەکـانـی لـە رووکـەشدا بـە دەستـی چـەپـە دەنووسییـەوە. ئـەوەش وای کـرد کـە نـووسیـنـەکـانـی لـەلای راستـەوە بـۆ لای چـەپـە دەست پـێ بـکـات. نـەك وەکـو ئـەو بۆچوونانەی کە دەڵێن تاوەکو کەس نەزانێت بیخوێنێتەوە(١٧).



تابلۆی (مزگێنی)، ١٤٧٣، رەنگی رۆنی شل و تەمپەرا لەسەر دار، ٩٨×٢١٧سم، فلۆرانسا ـ گەلەری ئۆفیزی.   (لیۆناردۆ داڤنشی)

---

(١٦) (دافنشی/ ص٢٣).

(١٧) (دیورانت/ ص٢٥١).



بەشەکانی ناو تابلۆی (مزگێنی)، ١٤٧٣، فلۆرانسا ـ گەلەری ئۆفیزی. (لیۆناردۆ داڤنشی)



بەشێکی باگڕاوندی ناو تابلۆی (مزگێنی)، ١٤٧٣، ڕەنگی ڕۆنی شل و تەمپەرا لەسەر دار،
فلۆرانسا ـ گەلەری ئۆفیزی. (لیۆناردۆ داڤنشی)



لێکۆڵینەوە لەسەر (جلوبەرگی کەسێکی دانیشتوو)، ١٤٧٢، فڵچە و تەمپەرای خۆڵەمێشی کە سپی تێیدا زاڵە، مۆزەخانەی لۆڤەر ـ پاریس. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی دەشت و دۆڵی ڕووباری (ئۆڕنۆ) لە فلۆرانسا، ١٤٧٣/٨/٥، قەڵەم، ١٩×٢٨,٥سم، فلۆرانسا ـ مۆزەخانەی ئۆفیزی. (لیۆناردۆ داڤنشی)



تابلۆی (پاکیزه و گوڵه قەرەنفول)، ١٤٧٢ ـ ١٤٧٨، رەنگی رۆنی شل لەسەر دار،
٦٢×٧٤,٥سم، میۆشن ـ ئەڵمانیا. (لیۆناردۆ داڤنشی)

## لیۆناردۆ ستۆدیۆکەی ڤیروکیۆ بەجێ دەهێڵێ

لیۆناردۆ لە ساڵی ١٤٧٦ ستۆدیۆکەی ڤیروکیۆ بەجێ دەهێڵێ و خانوویێك بە تەنیا بەکرێ دەگرێت، واتە بەسەربەخۆیی تێیدا کاری وێنەکێشان دەکات بۆیە لە ساڵی ١٤٨٠ بە بەڵگەی تۆماری ئاماری فلۆرانسا لە ماڵی باوکیشی دەردەچێت[١٨].

لە ساڵی ١٤٥٣دا تورکەکان کوستەنتینیەیان داگیر کرد، بۆیە زۆربەی ئەو زانا گریکییانەی کە لە کوستەنتینیە بوون رایان کرد، بە هۆی ئەوەی ئیتاڵیا پێشوازییەکی باشی لە زانا گریکییەکان دەکرد ئەوا زۆربەی زاناکان دەچوونە ئیتاڵیا، کە لە ئەنجامدا کاریگەرییەکی زۆری کولتووری گریکیان خستە سەر ئیتاڵیا[١٩].

بۆیە ئیتاڵیا لە سەرەتای سەدەی پازدە دەوڵەمەندترین وڵاتی ئەوروپایی بوو، لە شەش هەرێم یاخۆ ویلایەت پێك هاتبوو، وەکو شانشینی ناپۆلی و میرنشینی میلانۆ و کۆمارەکانی فلۆرانسا و ڤینیسیا و فیرارا و سافۆی، کە لە هەریەکێکیان بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند فەرمانڕەوایی تێدا گرتبووە دەست. لە ساڵی ١٤٠٠یش هەموو هەرێمەکانی ئیتاڵیا دەکەونە ژێردەستی فەرمانڕەوا بەهێزەکەی میلانۆ، تەنانەت فلۆرانسا نەبێت کە توانی بە هۆی سەرکردە بەهێزەکانی بەرپەرچی فەرمانڕەوای میلانۆ بداتەوە و نەکەوێتە ژێردەستی فەرمانڕەوایی میلانۆ. هەر بۆیە فلۆرانسا پاشان توانی ببێتە گرینگترین مەڵبەندی رۆشنبیری و هونەری لە ئیتاڵیا[٢٠].

فلۆرانسا ئەو کات ناوبانگی دەرکردبوو بە پەیکەرتاشین و وێنەکێشان و موزیکژەنین و ئەندازیاری شارەزا و دەست ڕەنگین، بۆیە فلۆرانسا لە ڕووی تەلارسازی و هونەر و وێژە... بووژانەوەیەکی زۆری بە خۆیەوە بینی، کۆشك و تەلاری جوان و بەهاداری لێ بوو کە بۆ میر و شازادە و دەوڵەمەندەکان دروست کرابوون. ئەو بووژانەوەیەش بە تایبەتی لە سەردەمی (لۆرنزۆ)ی فەرمانڕەوای فلۆرانسا ئەنجام درا کە بایەخێکی زۆری بەو کەسانە دەدا کە پیشەی هونەرییان دەکرد.

---

(١٨) (علی/ص٢).

(١٩) (هان/ ص١٧).

(٢٠) (علام/ ص٥٧).

شاری فلۆرانسا لە سەردەمی ڕێنیسانسی ئیتاڵیایی لانکەی هونەر بوو، لە سایەی فەرمانڕەواییکردنی بنەماڵەی (میدیتشی) لە ساڵی (١٤٢٤–١٤٩٤) فەرمانڕەواییی فلۆرانسایان کرد، شیاوی گوتنیشە سەرجەم کەسەکانی ئەو بنەماڵەیە چێژێکی زۆریان لە هونەر وەردەگرت و پشتگیرییەکی زۆریشیان لە هونەر و هونەرمەندان دەکرد. دیارترین ئەو فەرمانڕەوایانەی کە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر پێشخستنی باری ڕۆشنبیریی فلۆرانسا هەبوو (کۆزیمۆی شکۆدار) و (لۆرنزۆی مەزن) بوو. کۆزیمۆی شکۆدار توانی ئەکادیمیایەك بۆ وەرگێڕان و توێژینەوەی فەلسەفە و کتێبەکانی ئەفلاتوون دابمەزرێنێت(٢١).

ئەو دوو فەرمانڕەوایە توانییان دەستنووسە کۆنەکانی گریکی و بیزەنتی بهێننە فلۆرانسا کە پێشتر لە وڵاتی گریس و دیمەشق و ئەنتاکیا بوون. بۆیە پشتگیرییەکی زۆریان لەو توێژینەوە زانستییانە کرد کە پێوەندییان بە مرۆڤەوە هەبوو. بە هۆی ئەو پشتگیرییە زۆرەی کۆزیمۆ و لۆرنزۆ بۆ هونەرمەندان و زانایان لەسەر بەرهەمهێنان، فلۆرانسا بووە مەڵبەندی سەرەکیی هونەر و شارستانی، بۆیە تیشکی پێشکەوتنی فلۆرانسا کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر هەرێمەکانی تری ئیتاڵیا وەکو بیزا و جێنەوا و ڤینیسیا، بزاڤی هونەری لە ڕۆماش زۆر چالاك بوو، ئەوەش بە تایبەتی لەسەر دەستی ئەو پاپایانە بوو کە فەرمانڕەوایەتیی ڤاتیکانیان گرتبووە دەست وەکو (نیکۆلای پێنجەم) و (جۆلیۆسی دووەم) و (سکتۆسی شەشەم) و (لیۆی دەیەم) کە ئەمەی دواییان یەکێك بوو لە کەسایەتییەکانی نێو بنەماڵەی میدیتشی. ئەو فەرمانڕەوایانەی ڤاتیکان فێرخوازانیان دەناردە هەموو شوێنێك بۆ گەڕان بە دوای دەستنووسە کۆنەکانی گریکی و کۆکردنەوەیان لە کتێبخانەی ڤاتیکان. بۆیە هونەرمەندەکانی ئیتاڵیا بە هۆی ئەو پشتگیری و پێشکەوتنەی کە دەکرا لە کۆتاییی سەدەی چواردەدا توانییان ئازاد بن لە هونەری بیزەنتی و گوتی. هونەرمەند لەو سەردەمیدا توانی کەسایەتییەکی سەربەخۆی هەبێت و گرینگی بە ستایلی هونەری خۆی بدات و بەربەرەکانێش لەگەڵ هونەرمەندەکانی تر بکات. هونەرمەندەکانی فلۆرانسا ساڵ دوای ساڵ ناوبانگی هونەرییان زیاتر دەبوو، کاری هونەریی زیاتریان پێ ڕادەسپێردرا. تەنیا لیۆناردۆ نەبێت کە چانسی ئەنجامدانی کاری هونەریی زۆر پێ نەدەسپێردرا، لەبەرئەوەی لیۆناردۆ ناوبانگی بەوە دەرکردبوو کە زۆر سستە لە

(٢١) (یوسف/ص١٧).

کارکردن، لیۆناردۆ بە وردەکارییەکی زۆر لە ڕادەبەدەر کارەکانی ئەنجام دەدا، کە ئەوەش کاتێکی زۆری پێویست بوو. بەو شێوەیەش فەرمانڕەواکان و دەوڵەمەندەکان لێی دوور دەکەوتنەوە و کاری هونەرییان پێ ڕانەدەسپارد. بەڵام لیۆناردۆ هەموو کات بەهۆی بلیمەتییە بێ سنوورییەکەی ناوبانگی هەبوو، لەبەرئەوەی تەنیا یەکێك نەبووە لە هونەرمەندە مەزنەکانی ئەو سەردەم، بگرە لەوانەیە دیارترین زانای زانستی توێکاریش بووبێت، لیۆناردۆ زانیارییێکی زۆری سروشتیی لە بوارەکانی زانین هەبوو بەبێ ئەوەی کەسێك هەبێت بتوانێت خۆی هاوشانی بکات[٢٢].

لیۆناردۆ لیکۆڵینەوەی زۆری لە بوارەکانی وەکو زانستی رووەك و جیۆلۆجیا و سەرەتاکانی زانستی فڕین هەبوو. لەگەڵ هەندێشدا هەزاران تێبینی و وێنە هێڵکارییەکانی لیۆناردۆ لەبارەی ئەم زانستانە و زانستی ترەوە لەوساکەوە تاوەکو ئێستاش زۆر بە کەمی ئاشکرا دەکرێن.

لیۆناردۆ داڤنشی تەنیا سەرقاڵی هونەری شێوەکاری نەبوو، بگرە لە پاڵ پیشەی هونەری شێوەکاریدا موزیکژەن و ئەندازیار و زانا و ژیربێژ و جەنەراڵی سەربازی و کۆمەڵێك کاری تریشی لە ژیانیدا ئەنجام دا، هۆکارەکەشی ئەوەبوو کەوا لیۆناردۆ دەیویست لەلای میر و پادشا و بەگزادەکان بوونی خۆی بسەلمێنێ. بۆیە زۆر لە سەرچاوەکان لەوانەیە هۆکاری ئەو هەڵسوکەوتانەی لیۆناردۆ داڤنشی بۆ بارودۆخی ئەو کاتی وڵاتانی کۆمەڵگەی جیهان بگەڕێننەوە. لەبەرئەوەی لە سەردەمی ڕێنیسانسدا، هەتا پاش ئەو سەردەمیش هەموو هونەرمەندێك پێویستی بە میرێك یان پیاوێکی پایەبەرز هەبوو بۆ ئەوەی چاودێری و سەرپەرشتیی بکات، ئەو سەرپەرشتیارەش کاری پێ ڕادەسپارد و چارەنووسیشی دەستنیشان دەکرد[٢٣].

لیۆناردۆ داڤنشی هەر لە هەرەتی لاوێتیدا ئاواتەخواز بوو رۆژێك لە رۆژان بتوانێ بەرامبەر بە مووچەیەکی ساڵانە لەژێر خزمەتی (لۆرنزۆ)ی شازادەی فلۆرانسا کار بکات، تاوەکو بە مووچەکە ئەو کەرەستانەی دەست بکەوێ کە بۆ تاقیکردنەوەی هونەرە زانستییەکانی دەستیان دەدا.

لیۆناردۆ لە ساڵی ١٤٨١ لە فلۆرانسا زیاتر بایەخی بەسروشت دەدا و ئاستی

(٢٢) (بیتر، موری /ص١٩٣).
(٢٣) (فروید/ ص١٠٠).

زانستیی بەهێزتر دەکات و لەسەر پێوەندیی نێوان هونەر بە زانست، ماتماتیك بە بینایی دەنووسێت، زیاتر بایەخ بە لێکۆڵینەوە لەسەر توێکاری و زانستی رووەك و فەلەك و ئاو... دەدات، بۆیە ناتوانرێت هیچ جیاکارییەك لە نێوان کارە هونەری و ناهونەرییەکانی لیۆناردۆ بکرێت و پاساوی بۆ بهێنرێتەوە، لەبەرئەوەی لیۆناردۆ وێناکردنێکی جیاوازی بۆ نەکردوونە(٢٤).

ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە چالاکییە زانستی و هونەرییەکانی لیۆناردۆ لە یەك کانی هەڵدەقوولێن. بەم شێوەیەش ئەو ئەنجامانەی کە لە کارێکی لیۆناردۆ دەست دەکەوێت کاریگەری بەسەر کارەکانی تریشی هەبوو. لیۆناردۆ داڤنشی لە تێڕوانینێکی نیمچە فەلسەفییەوە باوەڕی وابوو کە پێوەندییەکی لە پچڕان نەهاتوو هونەر و زانست بەیەکەوە دەبەستێتەوە(٢٥).

لیۆناردۆ لێکۆڵینەوەکانی لەسەر سروشت لە ڕێگەی وێنەکێشانەوە ئەنجام دا، بۆیە لیۆناردۆ هەوڵە زانستییەکانی بۆ خزمەتکردنی هونەر نەبووە، بگرە خوازیاری زانین بووە بۆ زانین(٢٦).

لە ساڵی ١٤٨٨ لیۆناردۆ چەندین توێژینەوەی تر لەبارەی ڕوانگە و سێبەر و ڕووناکی... دەنووسێتەوە، کە بەشێکی زۆریان ئەگەرچی بەشێوەی تێبینیی جیاجیاشن، پاشان لە کتێبی (ئۆڕبینۆ- پەیامی وێنەکێشان)دا نووسرانەوە.

لە بواری توێکارییشدا، لیۆناردۆ لێکۆڵینەوەیەکی لە ساڵی ١٤٨٩ لەژێر ناوی ″وێنەی مرۆڤ لە گەڕان بە دوای پێکهاتەی ئەندامەکانی لەش و شێوەی کارکردنیەوە″ دەست پێ دەکات. کە پاشان ئەو کتێبە بە ناوی ″کتێبی توێکاری یان پەیامی توێکاری″یەوە ناسرا. ئەو کات لیۆناردۆ زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی لە نەخۆشخانەی (سانتا ماریا نۆڤا) ئەنجام دا(٢٧).

---

(٢٤) (علی/ص٢-٣).

(٢٥) (عطیه/ ص٩٣).

(٢٦) (فروید/ص٣١).

(٢٧) (بهنسی/ ص١٤٧).



نموونەیەکی هێڵکاریی ڕووەك، تەباشیری ڕەش و قەڵەم و مەرەکەب، ″١٤٧٥″، ٣١,٤×١٧,٧سم، کتێبخانەی شاهانە ـ ویندسۆر. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی (خاتوونە پاکیزە و منداڵ لەگەڵ پشیلە)، ١٤٧٨ قەڵەم، ٢،١٣×٩,٥سم، فلۆرانسا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی (خاتوونە پاکیزە لەگەڵ سەبەتە میوە)، ١٤٧٨، قەڵەم و مەرەکەب لەسەر جۆرە کانزایەکی تەنك، ٢٥,٢×٣٥,٨سم، پاریس - مۆزەخانەی لۆڤەر. (لیۆناردۆ داڤنشی)



تابلۆی (پاکیزە و منداڵەکەی)، ١٤٧٨، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار پاشان گوازراوەتەوە سەر قوماش، ٤٨×٣١سم، ڕووسیا - سان پترۆس بێرگ. (لیۆناردۆ داڤنشی)



تابلۆی (جیرۆمی پیرۆز - هیرۆنیمۆسی پیرۆز لە چۆڵەوانی)، ١٤٧٩ - ١٤٨١، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار، ١٠٣×٧٥سم، ڤاتیکان - ڕۆما. (لیۆناردۆ داڤنشی)



نموونەی هێڵکاری و تێبینییەکانی (لیۆناردۆ) لەسەر توێکاریی (پەیکەرە ئێسك)، ١٤٨٩، قەڵەمی جاف لەسەر تەباشیری ڕەش، ١٩×١٣,٧سم، ویندسۆر ـ کتێبخانەی شاهانە.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاری و تێبینیی (وێنەی مرۆڤ لە گەڕان بەدوای پێکهاتەی ئەندامەکانی لەش و شێوەی کارکردنیەوە)، ١٤٩٠، قەڵەمی گرافیك ـ ڕەساس لەسەر کاغەز، ٣٤,٣×٢٤,٥سم، ڤینیسیا ـ گەلەری ئەکادیمیای دێل. (لیۆناردۆ داڤنشی)

لیۆناردۆ لە تەمەنی بیست و حەفتساڵیدا بوو کە کارە هونەرییەکانی ناوبانگێکی زۆریان پەیدا کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە جەماوەر باوەڕێکی تەواویان بە بلیمەتیی لیۆناردۆوە هەبوو، بەڵام لە ڕووی مامەڵەکردنەوە؛ مامەڵەکردن لەگەڵیدا تۆزێك زەحمەت بوو. ئەوەش بە هۆی ئەوەوە بوو لیۆناردۆ ئەو کارانەی کە پێی دەسپێردرا زۆر بە سستی ئەنجامی دەدان، بۆیە "کات" لەلای لیۆناردۆ زۆر گرینگی نەبوو، ئەگەر بیزانیبایە لە توانایدا هەیە کارەکەی باشتر پێ دەکرێت، ئەوا لەوانەیە تابلۆ یان هەر کارێکی هونەری بۆ ماوەی چەند حەفتەیەك یان چەند مانگێك یان چەند ساڵێك دوادەخست. لەبەرئەوەی لیۆناردۆ هەردەم بەدوای داهێنانی ڕەنگ و پانتاییی نوێ دەگەڕا(٢٨).

لەوانەیە هۆکاری سستیی لیۆناردۆ لە ئەنجامدان و تەواوکردنی کارە هونەرییەکان ئەوە بێت کە ئامانجی لیۆناردۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە تەکنیکییانە بێت کە پێوەندییان بە ڕێکخستنی ڕەنگ و دیزاینەوە هەبێت، لێرەدا لیۆناردۆ گرینگیدانی بە کارەکەی نەدەما ئەو کاتەی کە چارەسەرییەکانی دەدۆزییەوە. لەبەرئەوەی دەیگوت: هونەر لە وێناکردن و دیزاینەوەیە نەك لە ئەنجامدانی کارەکە(٢٩).

تایبەتمەندیی لیۆناردۆ لەوەدا بوو کە مێشکی لە بیرکردنەوە نەدەوەستا، هەر کێشەیەك سەرنجی ڕاکێشابایە هەوڵی چارەسەرکردنی دەدا، توانیبووی لە ڕووی تەکنیکییەوە تاکایەتیی خۆی بپارێزێت و هیچ شێوەکارێکی بەر لە خۆی لە ڕووی هێڵ و ڕەنگەوە نەگات بەئاستی. لیۆناردۆ هێڵی تەنیا بۆ دەستنیشانکردنی وردەکارییەکان بەکار نەدەهێنا، بگرە وەکو هێمایەك بۆ باگراوندی هێڵەکە بەکاری دەهێنا. لیۆناردۆ ڕەنگیشی تەنیا بۆ جوانکاری بەکار نەدەهێنا بگرە وەکو ئامرازێك بۆ بەخشینی ژیان و کەش و هەوەسەکانی بەکار دەهێنا(٣٠).

بێگومان ئەگەر هەر کەسێك داوای لە لیۆناردۆ بکردبایە وێنەیەکی بۆ بکێشێت ئەوا پێش هەموو شتێك خوازیاری ئەوە بوو لە ماوەیەکی کورت وێنەیەکی جوانی بۆ بکێشێت، بەڵام لیۆناردۆ زۆربەی جارەکان داوای چاوەڕوانبوونی لێ دەکردن. لیۆناردۆ پاش ئەوەی لە فلۆرانسا ناوبانگێکی زۆری هونەریی پەیدا کرد خۆی زۆر بە

(٢٨) (هان/ ص٢٦).

(٢٩) (دیورانت/ ص٢٥٤).

(٣٠) (دیورانت/ ص٢٥٤).

شیاو زانی تاوەکو ببێتە وێنەکێشی تایبەتی شازادەی فلۆرانسا. لەگەڵ ئەوەشدا کەوا شازادەی فلۆرانسا ڕێزێکی بێ پایانی لە تواناکانی لیۆناردۆ دەگرت، بەڵام شازادەی فلۆرانسا هیچ نیشانەیەکی وای دەرنەدەبڕی تاوەکو لیۆناردۆ لەلای خۆی بەکار بخات، بێگومان ئەمەش هەروەکو گوتمان بە هۆی ئەوەوە بوو کەوا شازادەی فلۆرانسا هەستی بەوە کردبوو کە لیۆناردۆ زۆر سستە لە ئەنجامدانی پڕۆژەکانی.

بەهۆی ئەو ململانێ و کێشانەی کە شازادەی فلۆرانسا لەگەڵ پاشای ناپۆلی و پاپادا هەیبوو لیۆناردۆ ویستی ئەو هەلە بقۆزێتەوە، بۆیە هەر لە خۆیەوە بەبێ ئەوەی کەسێك داوای لێ بکات... لیۆناردۆ لەژێر ناوی نیشتمانپەروەری و دڵسۆزی بۆ شازادەی فلۆرانسا دەستی کرد بە دانانی دیزاینی چەندین پڕۆژەی جۆرەوجۆر بۆ بەرگریکردن لە فلۆرانسا و هێرشکردنە سەر دوژمنانی فلۆرانسا.

هەموو ئامانجی لیۆناردۆ لەو کارەشیدا ئەوە بوو کەوا شازادەی فلۆرانسا خەونەکانی لیۆناردۆ بهێنیتە دی و نزیکی بکاتەوە لە خۆی، واتە لە کۆشکەکەیدا شوێنێکی پێ بدات و بیکات بە ڕاوێژکاری خۆی لە بواری شەڕ و شارەزا لە کاروبارەکانی میرنشینەکەی. ئەوەش لەبەرئەوەی لیۆناردۆ پێی وابوو کە خۆی شیاوترین کەسە تاوەکو ببێتە وێنەکێشی شازادەی فلۆرانسا. بەڵام خەونەکانی لیۆناردۆ وەکو بڵقی سەر ئاویان لێ هات و نەمان، لەبەرئەوەی شازادەی فلۆرانسا توانی لەگەڵ دوژمنانی ڕێك بکەوێت تاوەکو بۆ ماوەیەك شەڕوشۆڕ ڕابگرن.

لیۆناردۆ بەهۆی ڕێککەوتنی ئەو ئاگربەستە کاتییەی نێوان شازادەی فلۆرانسا و دوژمنانی زۆر نیگەران و وەڕس بوو... ئەوەش لەبەرئەوە بوو کە لیۆناردۆ چەند مانگێك خەریکی دانانی دیزاینی ئەو چەکە کوشندانە بوو کە دەیویست دایان بهێنێت. هەر بۆیە لیۆناردۆ گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لە فلۆرانسا بچێتە دەرەوە، لەبەرئەوەی فلۆرانسا ئەو مافەی پێ نادات کە لیۆناردۆ بە خۆی ڕەوا دەبینی.

هەندێك لە مێژوونووسان هۆکاری چوونە دەرەوەی لیۆناردۆ لە فلۆرانسا بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کەوا ڕووداوێکی بێ ڕەوشتی لە فلۆرانسا ڕوو دەدات کە لیۆناردۆش یەکێك بووە لە بەشدارانی. لەبەرئەوەی لیۆناردۆ لە ٨ی ئەپریلی ١٤٧٦ بۆ یەکەم جار بەکاری بێ ڕەوشتی تاوانبار دەکرێت، ئەو کات فلۆرانسا جۆران کەسی ناوازەی لێ بوو، ئەو کەسە ناوازانەش خەڵك بە سووك سەیریان دەکردن. بۆیە بە هۆی ئەو



تابلۆی (جینێڤرا دێ بنچی)، ١٤٧٨ ـ ١٤٨٠، تەمپەرا لەسەر دار، ٣٨,٨×٣٦,٧سم، واشنتۆن ـ گەلەری نیشتمانیی هونەری. (لیۆناردۆ داڤنشی)




رووی پشتەوەی تابلۆی (جینێڤرا دێ بنچی)، ١٤٧٨ ـ ١٤٨٠،... (لیۆناردۆ داڤنشی)




هێڵکاریی (دەست)، ١٤٧٨ ـ ١٤٨٠، ٢١,٥×١٥سم، ویندسۆر ـ کتێبخانەی شاهانە.

(لیۆناردۆ داڤنشی)

تاوانبارکردنەی لیۆناردۆ و کەسەکانی تریش سزاکەیان ئەوە بوو کە ناویان لە بڵاوکراوەیەکی سەر دیوار لە دیواری "کۆشکی کۆنەوە" هەڵواسرا، سەرەتا ئەو تاوانبارکردنە لەلایان گەنجێکی شارەکە بڵاو کرایەوە کە ناوی "جۆڤانی سالتاریلی" بوو کە کۆمەڵێك گەنجی بەوە تاوانبار کرد کەوا ئاهەنگی بێ ئابڕوویی ساز دەکەن، بەڵام لە ٦ی جونای هەمان ساڵ دادگە دیسان بڕیارێکی تری دەرکرد و سەرجەم گەنجەکانی بە بێتاوان ناساند(٣١).

هەندێك لە سەرچاوەکان وای بۆ دەچن کە هۆکاری ئەو تۆمەتانە ناکۆکی بوو لەگەڵ کڵێسا، لەبەرئەوەی ئەو گەنجانە کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری ئازادیخوازی کراوەیان پێك هێنابوو، لە نێوان خۆشیاندا گفتوگۆیان لەسەر هەندێك شت دەکرد کە کڵێسا پێی ناخۆش بوو، وەکو ئەو بیر و بۆچوونەی کە دەیانگوت: رۆژ چەقی ئەستێرەکانە نەك زەوی، هەر لە هەمان کاتیشدا ئەو گەنجانە رێورەسمی ئاینییان بەجێ نەدەگەیاند و نەدەچوونە کڵێسا. بەو شێوەیەش ئەو گەنجانە بە بۆچوونی کڵێسا دەسخەرۆ بوونە. کڵێسا پێی وابوو ئەو گەنجانە مەترسییەکی گەورەنە بەسەر ئەو رەفتارە باوانەی کە دەسەڵاتی کڵێسا ئەو کات جەختی لەسەر دەکردەوە.

بەڵام هەندێك لە سەرچاوەی تر پێیان وایە کە دەرچوونی لیۆناردۆ لە فلۆرانسا و چوونی بۆ میلانۆ راکردن بوو لەوەی کە ناوی زرێندرا بوو لە فلۆرانسا. یان بە هۆی ئەوەوە بوو کەوا بێزار بوو بەدەست توندرۆییەکەی کڵێسا بەسەر هۆش و بیر... بۆیە ئەوەش سەرەتایەك بوو بۆ ئەو تۆقاندن و تیرۆر و توندرۆییە ئاینییەی کە لەسەر دەستی پیاوێکی ئاینی بە ناوی "ساڤۆنارۆلا" بوو کە پاشان بۆ ماوەیەك فەرمانڕەوایی فلۆرانسای گرتە دەست.

(جیرۆلامۆ ساڤۆنارۆلا) لە ٢١ی سێپتەمبەری ١٤٥٢ لە (فیرارا) لەدایك بووبوو، هەر لە سەرەتای تەمەنیدا زیرەکی و بلیمەتیی لێ بەدەرکەوت، بۆیە بنەماڵەکەی هیوایەکی زۆریان پێی هەبوو تا لە داهاتوودا هەڵگری پەیام و داوونەریتی بنەماڵەکەیان بێت(٣٢).

بە هۆی ئەو ناکۆکییانەی کە لە نێوان هەرێمەکانی ئیتاڵیادا هەبوو، ئەوا ئیتاڵیا لە

(٣١) (دافنشی/ص٢٣).

(٣٢) (عثمان/ص٢٢).

دوو بەرە پێکهاتبوو کە هەر بەرەیەکیان چەند هەرێمێکی ئیتاڵیای لەخۆوە گرتبوو. بۆیە فیرارا و فلۆرانساش کە لە یەك بەرەدا بوون ساڤۆناڕۆلا چووە فلۆرانسا. بەڵام سەرەتا لە فلۆرانسا زۆر دڵگران بوو بەوەی کە خەڵکی فلۆرانسا شێوە ژیانێکی تا ئاستێك دوور لە ئاینی کریستیانیان بەسەر دەبرد. کە ئەوەش بە هۆی ئەو شێوە حوکمڕانەی (لۆرنزۆ) بوو. بۆیە ساڤۆناڕۆلا لۆرنزۆی بە بەرپرسی ئەو گەندەڵییەی ناو کۆمەڵگە دادەنا. هەر لە هەمان کاتیشدا پیاوانی ئاینیی سەردەمەکەشی بە سیمبولی تەمبەڵی و مشەخۆری دادەنا. ساڤۆناڕۆلا کە خۆشی پیاوێکی ئاینیی کڵێسا بوو، بەڵام سەرەتا بە هۆی گوتارە توندەکانی جەماوەرێکی ئەوەندە زۆری نەبوو. لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی فلۆرانسی ئەوکات بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵگەکانی تری ئەو سەردەم زۆر پێشکەوتوو بوو، دەبووایە پیاوانی ئاینی زمانێکی هونەریی باشیان هەبێت تا جەماوەر لە دەوروبەری خۆیان کۆ بکەنەوە.

ساڤۆناڕۆلا زۆر بیری لەوە کردەوە کە چۆن جەماوەر لە خۆی کۆ بکاتەوە و کۆنترۆڵی بیر و هۆشی جەماوەر بکات. بۆیە پاش نووسین و بڵاوکردنەوەی چەند ئامۆژگارییەك و قۆستنەوەی چەند هەلێك توانی دەست بەسەر بیر و هۆشی جەماوەری فلۆرانسادا بگرێت. سەرەتا ساڤۆناڕۆلا توانی دەسەڵاتی بنەماڵەی (میدیتشی) لە فلۆرانسا لەناو ببات و کۆمارێکی پێشکەوتوو دابمەزرێنێت. ساڤۆناڕۆلا بەشێوەیەکی فەرمی دەسەڵاتی فلۆرانسای نەگرتبووە دەست، بگرە دەسەڵاتدارانی فلۆرانسا ڕێزیان لە ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەکانی ساڤۆناڕۆلا دەگرت، لەبەرئەوەی لایەنگیری زۆر بوو. بە هۆی ئەوەی ساڤۆناڕۆلا کۆمارێکی نوێی دامەزراند خەڵکی زۆر خۆشیان دەویست و ڕێزیان لێ دەگرت، زۆربەشیان لایەنگیریان دەکرد. لەبەرئەوەی پەیامی ئازادی دژی زۆردارییەکانی پاپا و بنەماڵەی میدیتشی بڵاو کردەوە و دژیان وەستا و توانی دەسەڵاتیان لە فلۆرانسا لەناو ببات. بەڵام ساڤۆناڕۆلا پیاوێکی ئاینی بوو خەڵك هەر ئەو کاتە پێویستیان پێی بوو تا دەسەڵاتی بنەماڵەی میدیتشیان پێی لەناوبرد، بۆیە لەوە زیاتر نەیانتوانی چیی تر توندڕۆیییەکەی ئەو جێبەجێ بکەن. بە هۆی ئەو فاکتەرانە و چەندین فاکتەری تریش جەماوەری ساڤۆناڕۆلا کەم بووەوە، تا لە کۆتاییدا دەسەڵاتداران و خەڵکی فلۆرانسا بە فەرمانی (پاپا) لە ١٧ی مارسی ١٤٩٨ نەیانهێشت ساڤۆناڕۆلا چیی تر لە بۆنەکاندا گوتار بڵێت، پاشان لە ٢٣ی مایۆی ١٤٩٨ بە هۆی پاڵەپەستۆی پاپا و دەسەڵاتدارانی فلۆرانسا کە زۆربەیان لایەنگرانی

بنەماڵەی میدیتشی بوون، لەگەڵ کۆمەڵێك فاکتەری تر (ساڤۆنارۆلا) و دوو لە هاوەڵانی لە لەداردران و تەرمەکانیشیان سووتێندرا و خۆڵەمێشەکانیشیان خرایە نێو رووباری (ئۆرنۆ).

جا مەبەست لێرەدا ئەوەیە ساڤۆنارۆلا ئەو کاتەی کە دەسەڵاتی زۆر بوو رووبەرووی هونەری شێوەکاریش بووەوە، لەبەرئەوەی دەیزانی کە هونەر زۆرترین کاریگەری بەسەر بنیاتی چێژی گشتییەوە هەیە. بۆ ئەو مەبەستەش داوای لە هونەرمەندانی شێوەکاری کرد کە ناوەرۆکی بابەتە شێوەکارییەکانیان تەنیا بابەتی کریستیانی بێت، ساڤۆنارۆلا دژی رەوتەکانی هونەری هاوچەرخی ئەوکات بوو، بەڵام سەرکەوتووش نەبوو بەوەی کە گیانی هونەریی کریستیانی بەسەر هونەرمەندەکانی ئەو سەردەم بسەپێنێت. لێرەشدا لیۆناردۆ داڤنشی لەوانەیە بە هۆی ئەو فاکتەرەوە لە فلۆرانسا دەرچووبێت.

سەرەڕای ئەوەی کە پاش لەدادگەدان لیۆناردۆ و ئەو کەسانەشی کە لەگەڵیدا بوون گشتیان بێ تاوان دەرچوون، بەڵام لیۆناردۆ ناوی زڕێندرا و لەکەدار بوو، بۆیە لیۆناردۆ بیری لەوە کردەوە کە بگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی، بەڵام (ڤنشی) هیچ داهاتوویەکی گەشی بۆ پێشخستنی ژیان لێوە بەدی نەدەکرا، بە هۆی نەبوونی هیچ داهاتوویەکی گەش بۆ پێشخستنی ژیان... لیۆناردۆ گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە بچێت بۆ (میلانۆ)، لەبەرئەوەی (میلانۆ)ش هەر وەکو فلۆرانسا دەوڵەمەند و ئاوەدان بوو، فەرمانڕەوایەکی بەهێزی لێ بوو ناوی (لۆدڤیکۆ مۆرۆ – سفۆرزا) بوو.

لیۆناردۆ پاش ئەوەی کە بڕیاری دا بچێتە میلانۆ، بە باشتری زانی کە یەکسەر بچێتە لای فەرمانڕەوای میلانۆ و تواناکانی خۆی پێشکێش بکات. بەڵام خۆ دەبێت لیۆناردۆ لە ڕێی کەسێکەوە (لۆدڤیکۆ)ی فەرمانڕەوای میلانۆ بناسێت، بۆ ئەمەش سوودی لە ناسینی شازادە (لۆرنزۆ)ی فەرمانڕەوای فلۆرانسا وەرگرت.

شازادە لۆرنزۆ ڕێزێکی زۆری لە لیۆناردۆ دەگرت و هاوپەیمانێتیشی لەگەڵ لۆدڤیکۆی فەرمانڕەوای میلانۆ هەبوو، بۆ ئەو مەبەستەش لیۆناردۆ دیارییەکی هونەریی زۆر باشی داهێنا کە بریتی بوو لە ئامێرێکی موزیکی (تار)ی زیوین کە لە شێوەی سەری ئەسپێك دای هێنابوو. سەرەتا لیۆناردۆ دیارییەکەی بۆ شازادە لۆرنزۆ برد، پاش سەرسوڕمانیی شازادە لۆرنزۆ بە جوانیی دیارییەکەی لیۆناردۆ! بەڵام

شازادە لۆرنزۆ بە باشتری زانی کە لیۆناردۆ دیارییەکە لەگەڵ ئەو پارچە کاغەزە راسپاردنەی کە دەینووسێت بۆ لۆدڤیکۆی ببات تاوەکو لۆدڤیکۆ ئاستی بەرزی تواناکانی لیۆناردۆ بزانێت.

سەیر نییە ئەگەر بڵێم لیۆناردۆ داڤنشی کەسایەتییەکی هەلپەرستی هەبوو، لە پێناو بەرژەوەندیی خۆی هەموو شتێکی دەکرد، ئەمەش تەنیا بۆ ئەوەوە بوو کە لە فەرمانڕەواکان نزیك بێتەوە و ببێتە کەسێکی نێو دەرباری شازادە و پادشا و فەرمانڕەواکان.



حەوشەی (کۆشکی کۆن) لە فلۆرانسا

بەشی دووەم

## ڕۆیشتن لە فلۆرانسا و چوونە میلانۆ بۆ لای لۆدڤیکۆ

لە سەرەتای ساڵی ١٤٨٢ ئەو کات لیۆناردۆ تەمەنی ٣٠ ساڵ بوو، فلۆرانسای جێ هێشت و چووە میلانۆ، گوتارێکی بۆ فەرمانڕەوای میلانۆ نووسی و لە گوتارەکەیدا تواناکانی خۆی لە بواری هونەری و ئەندازیاریدا روون کردەوە، چووە بەر خزمەتی فەرمانڕەوای میلانۆ. ئێستا ئەو گوتارەی لیۆناردۆ لە دەستنووسی "ئەتلانتیکس" پارێزراوە.

لیۆناردۆ پاش ئەوەی کەوا گەیشتە میلانۆ هەر زوو خۆی گەیاندە لای لۆدڤیکۆ و نامە راسپاردەکەی شازادە (لۆرنزۆ)ی دایە دەستی لۆدڤیکۆ و پاشان (تار)ەکەشی وەکو دیاری پێشکێشی کرد. لۆدڤیکۆ کە چاوی بە دیارییەکەی لیۆناردۆ کەوت دڵی زۆر پێ خۆشبوو، بەتایبەتیش پاش ئەوەی کە زانی لیۆناردۆ خۆی ئەو دیارییەی داهێناوە و دەشزانێ بیژەنێت. بۆیە لۆدڤیکۆ شەوەکەی ئاهەنگێکی رێك خستبوو، لیۆناردۆشی بۆ ئاهەنگەکە بانگهێشتن کرد[٣٣].

لۆدڤیکۆی فەرمانڕەوای میلانۆ لەو ئاهەنگەی کە شەوەکەی رێکی خستبوو لیۆناردۆی پێشکێشی مێوانانی ئاهەنگەکە کرد، لیۆناردۆش لەلایان خۆیەوە تارەکەی زۆر بە لێهاتوویی ژەنی و بە دەنگە خۆشەکەشی گۆرانیی فلۆرانساییی بۆ لۆدڤیکۆ و ئامادەبووانی ئاهەنگەکە چڕی. ژەنینی تارەکە و دەنگی لیۆناردۆ گشت ئامادەبووانی ئاهەنگەکەی سەرسام کرد! بە شێوەیەك کەوا پاش تەواوبوونی ئاهەنگەکە لۆدڤیکۆ داوای لە لیۆناردۆ کرد لەلای بمێنێتەوە. لیۆناردۆ پاش ئەوەی کە زۆر سوپاسی لۆدڤیکۆی کرد، هەستی بەوە کرد کە لەمەودوا دەتوانێت گشت ئامانجەکانی بهێنێتە دی.

لیۆناردۆ ئامێری موزیکی تاری کردە ئامرازێك بۆ خۆشیرینکردن و ناسینی لۆدڤیکۆ، هەروەکو چۆن زۆرجار هونەری شێوەکاریی کردووەتە ئامراز، بەڵام ئەوجارەیان هونەری موزیکی هەڵبژارد لەبەرئەوەی هونەری موزیك خێراترە و ئاسانترە بۆ گەیشتن بە جەماوەر. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لیۆناردۆ هەموو کات پایەی

(٣٣) (هان/ ص٣٠).

هونەری شێوەکاریی لە سەرجەم هونەر و زانستەکانی تر بە بەرزتر دادەنا لیۆناردۆ پێی وابوو کەوا موزیك (خوشکی بچووکی) وێنەکێشانە، وێنەکێش بە چاوەکانی رەهەندی شتەکان دیاری دەکات، بەڵام موزیکژەن بە گوێچکەکانی پلەکانی دەنگ دیاری دەکات[٣٤].

لیۆناردۆ ئەو چەند رۆژە کەمەی کە لە کۆشکی لۆدڤیکۆ بوو، هەستی بەوە کرد کەوا خەونە جوانەکانی وا لە دەست دەچن، لەبەرئەوەی لۆدڤیکۆ ئەو کەسە نەبوو کەوا رێز لە هونەرمەند و زانایان بگرێت، بگرە لۆدڤیکۆ کەسێك بوو ئاکار و هەڵسوکەوتێکی هۆڤیکارانەی هەبوو و بەردەوام خەریکی تەڵەکەبازی و پیلانگێڕان بوو، زۆر بە سووکیش سەیری خەڵکی دەکرد و حەزیشی لە چێژوەرگرتن و مەیخواردنەوە بوو، بە هیچ شێوەیەکیش بایەخی نەدەدا بە هونەری رەسەن و زانست و ئاوەدانکردنەوەی شار و شارۆکەکان و پیشەسازی و کشتوکاڵ و ئەندازەی شارەکان.

بۆیە لیۆناردۆ زۆر لەوە ترسا کە لۆدڤیکۆ تەنیا بە ژەنیار یان گۆرانیبێژی بزانێت و بۆ خۆشیی ئاهەنگەکانی شەوانە لای خۆی هێشتبێتییەوە، کە ئەمەش سووکایەتی پێکردن و گاڵتەجاڕییە بە توانا و بلیمەتیی لیۆناردۆ داڤنشی.

لەگەڵ ئەوەشدا کە لیۆناردۆ زۆر باشی دەزانی لۆدڤیکۆ کەسێکی تەڵەکەباز و پیلانگێڕە و سووکایەتیی بە هونەر و زانست و ئاوەدانکردنەوە دێت، بەڵام لیۆناردۆ بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی و پێشاندانی دڵسۆزی بۆ کردەوە نابەجێکانی لۆدڤیکۆ، وای بە باش زانی لۆدڤیکۆ ئاگەداری توانا بێ شومارەکانی بێت... هەر بۆیە لیۆناردۆ لیستێکی پێشنیازکردنی ئامادە کرد کە تێیدا نووسیبووی:

یەکەم: من دەتوانم پردی گەورە دروست بکەم کە زۆر بە ئاسانی بگوازرێتەوە لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر، ئەو پردانە لە کاتی شەڕدا زۆر سووك و بەهێزن و هەر لە هەمان کاتیشدا زۆر بە ئاسانی لێك دەکرێنەوە و زۆر بەخێراییش پارچەکانی پێکەوە دەبەسترێن.

دووەم: لە کاتی ئابڵۆوقەدانی قەڵاکانی دوژمن بە شێوازە تایبەتییەکانی خۆم دەتوانم ئەو قۆرت و چاڵانەی کە دوژمن ئاوی تێدا عەمبار کردوون لە دەوروبەری قەڵاکان ئاوەکانیان بەتاڵ بکەمەوە، بۆ ئەو کارەش ئامێری ئاسنین و پەیژەی

---

(٣٤) (دافنشی/ص٧١).

تایبەت دەتوانم دروست بکەم کە بە کەڵکی سەرکەوتنی دیوارە بەرزەکان دێت.

سێیەم: ئەگەر لە نێوان دوو سوپای دوژمنی یەکتری رووبار هەبێت و ئاستەنگ بێت بۆ شەڕکردن، ئەوا دەتوانم ئاراستەی رووبارەکە بگرم و دژی دوژمن بەکاری بهێنم، زۆر بە چاکیش دەتوانم چاڵ و کون لەژێر خاکدا لێ بدەم تاوەکو هێرشبەرەکانمان بە نهێنی بچنە نێو قەڵاکانی دوژمن.

چوارەم: دەتوانم زرێپۆش بە ئاسن دروست بکەم کە تۆپ و ئاگر بهاوێژێت، هەر لە هەمان کاتیشدا دەتوانم نارنجۆکی وا دروست بکەم کەوا سەربازانی دوژمن بسووتێنێ لەکاتی هێرشبردن. دەتوانم ئامێری واش دروست بکەم کەوا چەقۆی مەزنی هەبێت، ددانی چەقۆکانیشی وەکو مشار وابن تا لەو کاتانەی کە دوژمن هێرش دەکات سەربازەکانی ببڕێت و کەت و پەتیان بکات.

پێنجەم: لە کاتەکانی ئاشتیدا دەتوانم کۆشك و تەلار و پرد لەسەر رووبار و بەنداو و جۆگەی ئاودا دروست بکەم.

شەشەم: دەتوانم پەیکەرتان لە مەڕمەڕ و برۆنز و گڵێنە بۆ دروست بکەم، دەشتوانم تابلۆ و دیواربەندی ڕەنگاوڕەنگتان بۆ دروست بکەم.

لە بۆنەکانیش بۆ یادکردنەوەی باوکی بەڕێزتان دەتوانم پەیکەری باوکتان زۆر بەمەزنی و جوانی دروست بکەم، کە لەسەر ئەسپێك دانیشتبێت. دەتوانم لە باخچەی کۆشکە ئاوەدانەکەتان یان لە هەر شوێنێکدا کە خۆتان بەشیاوی دەزانن هەر ئێستا دەست بەو کارە مەزنە بکەم.

لە کۆتاییشدا رێگەم پێ بدەن کەوا بە کڕنۆشەوە خۆم و تواناکانم پێشکێشتان بکەم.

ئەمە هەندێك لە نووسینەکانی نێو لیستەکەی لیۆناردۆ بوو، کە پێشکێشی لۆدڤیکۆی فەرمانڕەوای میلانۆی کرد.

بەڵام لۆدڤیکۆ زۆر بە سووکی و گاڵتەجاڕییەوە لیستەکەی لیۆناردۆی خوێندەوە و لە کۆتاییشدا لیستەکەی فڕێ دا و کردییە قاقای پێکەنین و بەئامادەبووانی دیوەخانەکەشی گوت من لە ژیانی خۆم پیاوی وەکو ئەم فلۆرانساییە شێت و سەرلێشێواوەم نەبینیوە.

لیۆناردۆ هەر وەکو دارمابێ، هەستی بە سووکایەتی پێکردنێکی زۆر کرد، تەنیا ئەوەشی لە پێش مابوو کە کۆشکەکەی لۆدڤیکۆ جێ بهێڵێت.

زۆربەی خەڵکی ئەمڕۆش وەکو چەرخەکانی پێشتر پێویستیان بە جۆرێك لە سەرچاوەی وەکو دەسەڵات و فەرمانڕەوا هەیە تاوەکو خۆیانی پێوە دەربخەن. بەڵام تەنیا لیۆناردۆ توانی بەبێ ئەو یارمەتییە بژیت، بۆیە ئەو تایبەتمەندییەی لیۆناردۆ لەوانەیە نەکرابایە ئەگەر لە سەرەتای ژیانیدا لە سۆزی باوکی بێبەش نەبایە(٣٥). ئازایەتیی لیۆناردۆ پاشانیش زیاتر بەدەردەکەوێت کە توانی زۆر لێکۆڵینەوەی زانستی ئەنجام بدات، بۆیە لیۆناردۆ لە ئازادیی زانستی بەردەوام بوو و لە هەوەسبازیشدا نزیك نەدەبووەوە.

مرۆڤ سروشتێکی دووفاقی هەیە، لەبەرئەوەی لەلایەکدا ئاژەڵێکی نێو مێگەلە، دەستنیشانی کردەوەکانی بەپاڵنەرە سروشتییەکانی بەدواوەی رابەر دەکەوێت، تاوەکو پێوەندییەکی توندوتۆڵی بە مێگەلەوە هەبێت، لەلایەکی تریش لەبەرئەوەی مرۆڤە ئەوا هۆشیارە و مێشکی هەیە کە پێیەوە دەتوانێت لە دۆخێکی سەربەخۆ بژیت و لە مێگەل دوور بکەوێتەوە، بەڵام مرۆڤ هەرچەندە بەشێك بێت لە مێگەل ئەوا زیاتر هەست بە دڵنیایی دەکات، لێرەدا مەترسیی گەورە لەوەدایە ئەگەر پێوەندییەکانی بە مێگەل لەدەست بدات، لەبەرئەوەی بەتەنیایی و گۆشەگیری دەمێنێتەوە، بۆیە تەنیا پاڵەوانە راستەقینەکانی رەگەزی مرۆڤایەتی دەتوانن بەرگەی ئەو گۆشەگیرییە بگرن(٣٦).

لیۆناردۆ بە هۆی ئەو توانایانەی کە لە زۆربەی بوارەکاندا هەیبوو، سەرەڕای ئەو توانا بێ شومارەنەشی ئەوا لەلای لۆدڤیکۆ بە سووکی سەیر دەکرا، بەڵام لیۆناردۆ هیچ رۆژێك لە ژیـنـیـدا رازی نەبووە راستەوخۆ لەلایان هیچ کەسێکەوە گاڵتە بە بلیمەتییەکەی بکرێت، بۆیە لە زۆربەی قۆناغەکانی ژیانی بە هۆی رێزنەگرتن لە زانیارییەکانی، کۆشك و دەربـاری فەرمانڕەواکانی جێ هێشتووە و لەنێو مێگەل دەرچووە، بەبێ پشتگیری بە تەنیا لە هەوڵە زانستییەکانی بەردەوام بووە. سەیر لەوەدایە کە باشترین کارە هونەرەکانی لیۆناردۆ ئەو کاتانە بووە کە لیۆناردۆ لەنێو دەربارەکان دەرچووە، واتە بەبێ پشتگیریی رابەرەکان گەورەترین کاری هونەری و توێژینەوەی زانستی لە بوارە جیاجیاکاندا ئەنجام داوە کە تاوەکو ئێستاش جێگەی تێرامان و سەرسوڕمانی مرۆڤایەتین. بێگومان ئەم ئارام نەگرتن و پاڵەوانێتییەی لیۆناردۆ دەگەڕایەوە بۆ سەرەتاکانی ژیانی، ئەو کاتەی کە لەلای دایکەکەی و

(٣٥) (فروید/١٠٢).

(٣٦) (حماد/ص٩١).

زڕباوکەکەی دەژیا و لە زۆر شت بێبەش بوو، سەرەڕای ئەوەش کە پاشان چووە ماڵی باپیری ژیانی بەسەربرد، بەڵام لەوانەیە بە هۆی ئەوەی کە هەستی بەوە دەکرد لە ئەنجامی کارێکی ناشەرعی لەدایك بووە بۆیە هەموو کات هەستێکی خۆبەکەمزانی هەبوو، هەردەم خوازیار بوو لە ژیانیدا ببێتە کەسایەتییەکی زۆر مەزن، تاوەکو قەرەبووی کەموکورییەکانی پێ بکاتەوە کە لە ناخی دەرنەدەچوو. لەلای (فرۆید) پێنج ساڵی سەرەتای ژیانی مرۆڤ زۆر گرینگە بۆ دەستنیشانکردنی کەسایەتیی مرۆڤ. ئەو دڵەڕاوکێ و ژینگە نالەبار و سەختەی کە لیۆناردۆ تێیدا دەژیا بە هۆی ئەوەوە بوو کە پێنج ساڵی سەرەتای ژیانی دوور بوو لە باوکی بۆیە هەستی بە دڵنیایی نەدەکرد لە ژیانیدا کە لە ئەنجامی ئەو هەست نەکردنە بە دڵنیایی دووچاری کاردانەوەی شپرزەیی بووبوو[٣٧].

لیۆناردۆ لای گرینگ نەبوو لەلای چ فەرمانڕەوایەك کار دەکات، بگرە گرینگ ئەوە بوو کە ئەو کەسە فەرمانڕەوا بێت جا ئەگەر فەرمانڕەواکە تاوانبار بێت یان پیلانگێڕ یان چەوسێنەری میللەت. بگرە ئەوەی گرینگ بوو لای لیۆناردۆ ئەوە بوو کە ببێتە کەسایەتییەکی دەرباری فەرمانڕەواکان.

لیۆناردۆ داڤنشی لە زۆربەی قۆناغەکانی ژیانیدا نەیتوانی ئامانجەکانی لە ڕێگەی شازادە و پادشا و فەرمانڕەواکاندا بهێنێتە دی، بۆیە بە هۆی بەدینەهاتنی مەرامەکانی چەندین جار تووشی تێکشکان بووەوە، بەڵام هەر ئەو تێکشکانانەش بوونە هۆکاری ئەوەی کە لە جاران زیاتر هەوڵ بدات تاوەکو ئامانجەکانی بهێنێتە دی.

بەڕای (ئەدلەر) گرێی خۆبەکەمزانی بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی تاك سەرنەکەوتوو بووە لە بەدەستهێنانی هەستکردن بە سەرکەوتن، لەبەرئەوەی ئەدلەر پێی وایە سەرکەوتن بەشێکی بنچینەییە لە پاڵنەرە کۆمەڵایەتییەکان، واتە هەستکردن بە مەزنی لای ئەو کەسەی کە بە شێوەیەکی باش ڕاهاتووە لەسەر مەزنی و کۆنترۆڵی لەسەر خودی خۆشی زیاترە نەك کۆنترۆڵکردنی کەسانی تر، ئەمە واتە توانای بەکارهێنانی ئەو پشتگیرییانەی هەیە بۆ بەرژەوەندیی کۆمەڵگە، ئەو کەسەی بە هۆی کەمئەندامییەکەی، یان بە هۆی ئەوەی ژینگەیەکی باشی نییە...، لە تواناشیدا نییە بەدەستیان بهێنێ، ئەوا

---

(٣٧) (فروید/ ص٦).

بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو کەموکورپیانە لە کاتی زیاترکردنی تواناکانی لەوانەیە لە بوارێك لە بوارەکان سەرکەوتنێکی زۆر بەدەست بهێنێ[٣٨].

بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێم کە هونەرمەند چەندە زیاتر هونەرەکەی پێ بگەیەنێت ئەوا ئەوەندەش بوارەکانی تری چالاکیی وەکو بیرکردنەوەی پراکتیکی و ژیانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی گشتی ڕووەو ئاستێکی خراپ دەچێت[٣٩].

(٣٨) (فونتانا/ ص٧٨).

(٣٩) (صالح/ص٥٥).

## لیۆناردۆ لە دەرەوەی دەرباری لۆدڤیکۆ ناوبانگێکی زۆر باش پەیدا دەکات

پاش ئەوەی لیۆناردۆ کۆشکی لۆدڤیکۆی جێ هێشت، چووە ستۆدیۆکەی (ئەمبریجیۆ دێ بردێ)، لەگەڵ ئەمبریجیۆ بەیەکەوە بۆ ماوەی حەفت ساڵ کاری وێنەکێشانیان ئەنجام دا، لەو ماوەیەشدا لیۆناردۆ توانی زۆر شت لەبارەی زانستی توێکارییەوە شی بکاتەوە، بە تایبەتیش توێکاریی دار و رووەك، هەر لە هەمان کاتیشدا لیۆناردۆ زۆر حەزی بەوە دەکرد کە وێنەی ئەو کەسانە بکێشێت کە تەمەنیان گەورە بوو، هەر بۆیەشە لە کوچە و کۆڵانەکانی میلانۆ بە دوای ئەو کەسانەدا دەگەڕا کە رووی دەموچاویان چرچ و لۆچی زۆری تێدا بوو و پیر بوون، یان ڕوویێکی زۆر مەترسیدار و ناشیرینیان هەبوو؛ ئەمەش بۆ ئەوە بوو تاوەکو زیاتر شارەزای زانستی توێکاری بێت.




نموونەی هێڵکاریی مرۆڤی پیر... (لیۆناردۆ داڤنشی)









هەندێك نموونەی هێڵكاریی مرۆڤی پیر یان ئەو كەسانەی كە ڕووێكی مەترسیداریان هەیە..

(لیۆناردۆ داڤنشی)



نموونەی هێڵکاریی مرۆڤی پیر... (لیۆناردۆ داڤنشی)



نموونەی لێکۆڵینەوەیەکی لیۆناردۆ لەسەر هێڵکاریی ڕووی مرۆڤ، ١٤٨٥– ١٤٩٠، ئینگلتەرا ـ مۆزەخانەی ویندسۆر

نموونەی لێکۆڵینەوەیەکی لیۆناردۆ لەسەر هێڵکاریی ڕووی مرۆڤ، مۆزەخانەی ڤینیسیا

ماوەی ئەو حەفت ساڵەی کە لیۆناردۆ لەگەڵ ئەمبریجیۆ بوو بازاڕی وێنەکێشانیان زۆر باش بوو، توانی پارەیەکی زۆر کۆ بکاتەوە. لە ئەنجامی ئەوەی کە لیۆناردۆ پارەیەکی زۆری پاشەکەفت کرد بڕیاری دا لە ئەمبریجیۆ جیا ببێتەوە و پەیمانگەیەکی تایبەت بەوێنەکێشان و پەیکەرتاشی دابمەزرێنێت.

لیۆناردۆ لەو سەردەمیدا ناوبانگێکی زۆری بۆ خۆی پەیدا کردبوو، هەر بۆیە لە گشت شوێنێکدا قوتابیانی هونەری شێوەکاری خوازیاری ئەوە بوون کە لەسەر دەستی لیۆناردۆوە درێژە بەخوێندنی هونەری شێوەکاری بدەن. بەڵام کەسایەتیی لیۆناردۆ داڤنشی وا هەڵکەوتبوو کەوا هەردەم لە هەلێکدا بگەڕێت تاوەکو بگەڕێتەوە نێو کۆشك و تەلارەکانی شازادە و پادشاکان.

پاشان لیۆناردۆ لەسەر بانگهێشتنی پیاوانی کڵێسای (سان دۆناتۆ) دەگەڕێتەوە فلۆرانسا و لەسەر راسپاردەی هەمان کڵێساش لە ساڵی (١٤٨١ و ١٤٨٢) تابلۆی (کڕنۆشبردنی پادشا ئاگرپەرستەکان)ی لە پشت کوشتارگەی کڵێسای (سکۆبتۆ)ی نزیك فلۆرانسا دروست کرد. بەڵام بەتەواونەکراوی بەجێی هێشت، لەبەرئەوەی لە ساڵی (١٤٨٢) دیسان فلۆرانسا بەجێ دەهێڵێتەوە و دەگەڕێتەوە میلانۆ، بۆیە لەو گەشتەیدا تا (١٨) ساڵ نەگەڕایەوە فلۆرانسا. لەگەڵ ئەوەشدا بەگوێرەی رێککەوتنەکەی لەگەڵ کڵێسا دەبووایە لە ماوەی چوار مانگدا تابلۆیەکە تەواو بکات، بەڵام نەیتوانی(٤٠).

ئەو کارە هونەرییە تەواونەکراوەی لیۆناردۆ بە یەکێك لە گرینگترین کارە هونەرییەکانی چارەگی کۆتاییی سەدەی پازدە دادەنرێت، ئەو تابلۆیە قەوارەکەی نزیکەی هەشت پێ چوارگۆشەیە. گرینگیی ئەو تابلۆیەش لەوەدایە کە لیۆناردۆ لەو کارەیدا توانیویەتی کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر دروست بکات لەنێو تابلۆیەك کە لە دەوروبەری چەند کەسێکدا کۆ بوونەتەوە، ئەو کۆمەڵە کەسەش نەیانتوانیوە کاریگەریان لەسەر بینەر و ئەو کەسانەوە هەبێت کە لە ناوەندی تابلۆکە کێشراون(٤١).

لیۆناردۆ لەو کارە هونەریەیدا شێوەیەکی هەرەمیی بۆ کەسایەتییە گرینگەکانی پێشەوەی تابلۆکە بەکار هێناوە، بەشێوەیەك کاتێك بینەر سەیری ئەو تابلۆیە دەکات

(٤٠) (علی/ص٣).

(٤١) (بیتر– موری /ص١٩٧).

یەکسەر چاوی بۆ بینینی کەسەکانی پێشەوە دەچێت کە بەیەکەوە شێوەیەکی هەرەمییان پێك هێناوە. زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێم ئەو تابلۆیە دەستپێشخەرییەکی زۆر زەقی هونەری سەردەمی ڕێنیسانس بووە. لیۆناردۆ لەو تابلۆیەیدا هەموو ئەو پێوەندییە باوانەی کە لەو سەردەمدا هەبوون لەبارەی ڕێبازی وێنەکێشانەوە بەلاوە دەنێت و شێوەیەکی تری وێنەکێشان دادەهێنێت کە ئاراستەی وێنەکیشانی فلۆرانسایی و ئیتاڵیایی بۆ داهاتوو دەگۆڕێت.

بۆیە هونەرمەندی داهێنەر ئەو هونەرمەندەیە کە بتوانێت تاکایەتیی خۆی لە هونەرەکەی دەرببڕێ. لیۆناردۆش توانی جگە لە داهێنانەکانی تری؛ ئەو داهێنانانەش بکات، بەشێوەیەك کە تاوەکو ئێستاش کاریگەری بەسەر هونەرمەندانەوە هەیە[٤٢].

لیۆناردۆ لە ساڵی ١٤٨٣ لە میلانۆ تابلۆیەکی تری بەناوبانگی پێ ڕادەسپێردرێت کە تابلۆی (پاکیزەی ناو تاشەبەردان)ە[٣٤] ئەگەر تێبینیی ئەو کارە هونەرییەی لیۆناردۆ بکەین ئەوا بەردەکانی نێو دیمەنی تابلۆکە جیا نەبووینەوە لەو کەسانەی کە پێ دەچێت بەدەوری ئەو کەشە خەیاڵ ئامێز و ڕۆمانتیکییە شاراوە بەسێبەرەوە دەسووڕێنەوە. پاش داهێنانی سێبەر لەلایەن لیۆناردۆوە، سێبەر دەبێتە توخمێکی سەرەکیی تابلۆ شێوەکارییەکان[٤٤].

تابلۆی (پاکیزەی ناو تاشەبەردان) بە هۆی ئەوەی دوو تیراژی هەبوو بۆ ماوەیەکی زۆر گفتوگۆیەکی زۆر دروست دەکات. یەکێك لە تیراژی ئەو تابلۆیە ئێستا لە مۆزەخانەی لۆڤەرە لە پاریس. بەڵام تیراژەکەی تر لە (مۆزەخانەی نیشتمانی – گالێری نیشتمانی)یە لە لەندەن. بوونی دوو تابلۆی وەکو یەکتری بۆ هیچ کامێك لە هونەرمەندانی سەدەی پازدە کێشە نەبووە. بەڵام لیۆناردۆ کە لە ژیانیدا چەند تابلۆیەکی دروست کردووە، بۆیە گومان لەوەدایە کە لیۆناردۆ دوو تابلۆی وەکو یەکتری دروست کردبێت. ئەو بەڵگەنامانەی کە بۆ ساڵانی (١٤٨٣ تا ١٥٠٦) دەگەڕێنەوە وا دەردەخەن کە لیۆناردۆ یەك تیراژی دروست کردووە. زۆربەی

---

(٤٢) (صالح/ص٦٧).
(٤٣) (بيتر- موری /ص١٩٩).
(٤٤) (علام/ص٨٨).



هـێڵـكـاريـيـەك بـۆ خـۆ ئـامـادەكـردن و دروستـكـردنـی بـاگـراونـدی تـابـلـۆی (كـڕنـۆشـبـردنـی پـادشا ئاگرپەرستەكان)، ١٤٨١، قەڵەم و مەرەكەبی قاوەیی، ١٦,٥×٢٩سم، فلۆرانسا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵكارییەكی سەرەتایی بۆ ئەنجامدانی تابلۆی (كڕنۆشبردنی پادشا ئاگرپەرستەكان)، دەوروبەری ساڵی ١٤٨١، قەڵەم، ٢٨,٥×٢١,٥سم، پاریس - مۆزەخانەی لۆڤەر (لیۆناردۆ داڤنشی)



كاری خۆ ئامادەكردن بۆ ئەنجامدانی تابلۆی (كڕنۆشبردنی پادشا ئاگرپەرستەكان)، ١٤٨١ - ١٤٨٢ ، بە ڕەنگی ڕۆنی شل، ڕەنگی قاوەییی ئاوی لەسەر دار، ٢٨,٥×٢١,٥سم، پاریس - مۆزەخانەی لۆڤەر. (لیۆناردۆ داڤنشی)

رایەکانیش بۆ ئەوە دەچن کە تیراژەکەی لەندەن تیراژی تەواوە. گومان لەوەشدا نییە کە تابلۆیەکەی پاریسیش لیۆناردۆ دروستی کردووە، بەڵام پێ دەچێت کە لە تابلۆیەکەی لەندەن کۆنتر بێت، مێژووی دروستکردنی بۆ سەردەمی فلۆرانسا بگەڕێتەوە.

بە هۆی ناوبانگیی لیۆناردۆ لە بواری هونەریدا دەسەڵاتدارانی میلانۆ داوایان لە لیۆناردۆ کرد کەوا سەرپەرشتیی ئاهەنگی بووك گواستنەوەی (جیان)ی فەرمانڕەوای یاساییی میلانۆ بکات و دیزاینی جوانکاریی کۆشکی شازادە جیان ئامادە بکات.

لیۆناردۆ زۆر دڵخۆش بوو بەو داوایەی بەرپرسانی میلانۆ، بۆیە دەستی بە دانانی دیزاینی جوانکاریی ئەو شوێنە کرد کەوا ئاهەنگی بووك گواستنەوەکەی تێدا ساز دەکرا.

لە ئەنجامدا لیۆناردۆ توانی شوێنێك دابهێنێت بۆ ئاهەنگگێڕان کە سەرنجی گشت ئامادەبووانی ئاهەنگەکەی بۆ خۆی رابکێشێت و ئامادەبووان دڵخۆش و شاد و



تابلۆی (پاکیزەی ناو تاشە بەردان) لەناو ئەشکەوت، ١٤٩٠ ـ ١٥٠٨، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار، ١٨٩,٥×١٢٠سم، لەندەن ـ مۆزەخانەی نیشتمانی. (لیۆناردۆ داڤنشی)



تابلۆی (پاکیزەی ناو تاشە بەردان) لەناو ئەشکەوت، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار، ١٩٩×١٢٢سم، پاریس ـ مۆزەخانەی لۆڤەر. (لیۆناردۆ داڤنشی)



وردەکارییەکانی ناو تابلۆی (پاکیزەی ناو تاشە بەردان) مۆزەخانەی لۆڤەر...
(لیۆنارد داڤنشی)



هێڵکاریی فریشتەکەی ناو تابلۆی (پاکیزەی ناو تاشە بەردان)، قەڵەم لەسەر کاغەزێکی
بەئاستەم قاوەیی، ۱۸،۲×۱۵،۹سم، فلۆرانسا. (لیۆناردۆ داڤنشی)

کامەران بکات.

رۆژی ئاهەنگەکە ناوبانگی لیۆناردۆ داڤنشی گەیشتە لووتکەی بریسکانەوە، هەتا وەکو (لۆدڤیکۆ)ش کە ئامادەی ڕێورەسمی ئاهەنگەکە بوو، دەستی لیۆناردۆی توند گوشی و لە باوەشی خۆشی گرت، داوای لە لیۆناردۆ کرد بگەڕێتەوە نێو کۆشکەکەی تاوەکو لەژێر سێبەری خۆیدا داهێنانە مەزنەکانی ئەنجام بدات.

ئەو هەڵسوکەوتەی لۆدڤیکۆ تەنیا بۆ ئەوە بوو کەوا داهێنانەکانی لیۆناردۆ بۆ خۆی قۆرخ بکات و سەرنجی جەماوەر بۆ خۆی رابکێشێت، ئەوەش وەکو پێشەکییەك بوو تا بە تەواوی دەست بەسەر میلانۆ دابگرێت. لەبەرئەوەی لۆدڤیکۆ لە جیاتیی (جیان)ی کوڕە خوشکی فەرمانڕەوایەتیی (میلانۆ)ی دەکرد، بەردەوامیش لە ئامادەکردن و داڕشتنی پیلاندا بوو تاوەکو (جیان)ی کوڕە خوشکی بە شێوەیەکی یاسایی لە دەسەڵات دوور بخاتەوە و خۆی بە شێوەیەکی یاسایی دەسەڵاتی رەهای میلانۆ بگرێتە دەست.

لیۆناردۆ بەهەلی زانی کە ئەو هەلە لە دەستی خۆی نەدات و بگەڕێتەوە نێو کۆشکی لۆدڤیکۆ. بۆیە گشت ئەو سەرکەوتنانەی لە بواری هونەریدا کە لەو چەند ساڵەی لە کۆشکی لۆدڤیکۆ دوور بوو بەدەستی هێنابوو بەلاوەی نا و گەڕایەوە نێو دەرباری لۆدڤیکۆ.

لە راستیدا لیۆناردۆی بلیمەت بە درێژاییی ژیانی لە زۆر بابەتی مەزندا هەر بە منداڵی مابووەوە. بۆیە دەگوترێت کەوا هەموو کەسێکی مەزن شتێکی منداڵانەی تێدا هەیە. لیۆناردۆ بەردەوام حەزی لە یاریکردن بوو، لەبەر ئەو هۆیەشەوە هەندێك جار وا بەدەردەکەوت کەوا هەڵسوکەوتێکی نامۆی هەبێت و کەسەکانی ئەو سەردەم لێی تێ نەگەن. بۆیە سەرسوڕمان دامان ناگرێت بەوەی کە لیۆناردۆ دیزاینی یاریی میکانیکی دروست کردبێت... بۆ پێشاندانیان لە ئاهەنگ و پێشوازییەکانی دەربار. واش پێ ناچێت کەوا لیۆناردۆ رۆژێك لە رۆژان پەشیمان بووبێتەوە لەوەی کە هونەرەکەی لەو شتانە بە فیڕۆ دابێت(٤٥).

(٤٥) (فروید/ص١٠٨).



پڕۆژەی دیزاینێك بە تێبینییەوە بۆ دروستكردنی (كڵێسای سەرەكی و گومبەتەكەی لەگەڵ هەشت ژووری بچووك)یدا، ١٤٨٤، بە قەڵەم هێڵكاریی بۆ كراوە، پاریس - پەیمانگەی فرەنسایی. (لیۆناردۆ داڤنشی)

## گەڕانەوە بۆ دەرباری لۆدڤیکۆ، لیۆناردۆ دایکی دەبینێت!

پاش گەڕانەوەی لیۆناردۆ بۆ دەرباری لۆدڤیکۆ یەکەمین پرۆژە کە لۆدڤیکۆ بە لیۆناردۆی سپارد دروستکردنی پەیکەرێکی مەزن بوو بۆ باوکی کە بەرزییەکەی هەشت مەتر بوو. لێرەدا تەنیا شتێکی باش کە لیۆناردۆ لەو سەردەمیدا کردبێتی ئەوە بوو کە بە دوای ئەسپێکدا دەگەڕا کە لەشی هیچ خەوشێکی نەبێت، بۆیە ڕۆژانە لیۆناردۆ لە میلانۆ و دەوروبەریدا دەگەڕا و لە جەستەی چەندین ئەسپدا رادەما و دەستنیشانی ئەو کەموکوڕییانەی دەکرد کەوا لە جەستەی ئەسپەکاندا هەیە. لە ئەنجامی گەڕانی لیۆناردۆ وێنەکێشانی ئەسپەکانی لە ڕووی توێکارییی لێ کەوتەوە.

ئەگەر تێبینیی کتێبەکەی لیۆناردۆ (ئۆڕبینۆ- دەربارەی وێنەکێشان - پەیامی وێنەکێشان) بکەین ئەوا بەڕای لیۆناردۆ وێنە و داتاشین جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە تەنیا تەقەڵا یان ماندووبوونی جەستەیی نەبێت، لەبەرئەوەی پەیکەرتاش کاتێك کە پەیکەرێك دروست دەکات رێژەیەکی زیاتری توانای جەستەییی پێویستە تاوەکو پەیکەر دروست بکات، بەڵام وێنەکێش لە وێنەکێشاندا هزری زیاتر ماندوو دەکات بۆ دروستکردنی وێنە. بۆیە پایەی وێنە لە داتاشین زیاترە لەبەرئەوەی داتاشین زۆر لایەنی دیاردەکانی سروشتی تێدا نییە[٤٦].

لیۆناردۆ بەر لەوەی پەیکەرەکەی باوکی لۆدڤیکۆ بە برۆنز دروست بکات سەرەتا (ماکێتێکی) قەوارە مامناوەندی پەیکەرەکەی دروست کرد. بەڵام لیۆناردۆ بە ناچاری دەستی لە کارەکەی هەڵگرت، ئەمەش بە هۆی ئەوەی لۆدڤیکۆ داوای لێ کرد کە سەرپەرشتیی جوانکاریی ئاهەنگی بووك گواستنەوەی خۆی بۆ بکات.

ئاهەنگی بووك گواستنەوەی لۆدڤیکۆ بە سەرکەوتوویی کۆتایی پێ هات، بە شێوەیەك کە لیۆناردۆ دیزاینێکی وای بۆ کردبوو کە لایەنگرانی (جیان)ی کوڕە خوشکی لۆدڤیکۆ گشتیان تۆقان لە ترسان! ئەمەش بە خستنە ڕووی چەکی جۆرەوجۆری ئەو سەردەم، کە شاری میلانۆ لە ڕۆژی ئاهەنگەکەدا رەنگێکی تۆتالیتاری دەدایەوە.

---

(٤٦) (دافنشی/ص ٧٤ - ٧٩).

پاش تەواوبوونی ئاهەنگەکە لیۆناردۆ ویستی بگەڕێتەوە سەر کاری تەواوکردنی پەیکەرەکەی باوکی لۆدڤیکۆ، بەڵام لیۆناردۆ نەیتوانی بگەڕێتەوە سەر کارەکەی، لەبەرئەوەی بووکەکەی لۆدڤیکۆ هێشتا تەمەنی لە پازدە ساڵیدا تێ نەپەڕیبوو و بچووك بوو، بۆ ئەوەی بووکی تازە هەست بە بێزاری نەکات لۆدڤیکۆ داوای لە لیۆناردۆ کرد کەوا ڕۆژانە ئاهەنگ بۆ خێزانەکەی ساز بکات.

بۆ رازیکردنی لۆدڤیکۆ پیشەی ڕۆژانەی لیۆناردۆ بووبووە سازدانی ئاهەنگ و درامای کۆمێدی، گۆرانی گوتن، ژەنینی تار، لە سەرووی هەموو ئەمانەش دەبوایە چیرۆکە کۆنەکان سەرلەنوێ دابڕێژێتەوە و ئەزبەریشیان بکات و بۆ خێزانە نوێیەکەی لۆدڤیکۆیان بگێڕێتەوە، تاوەکو هەست بە بێزاری نەکات. سەرەڕای ئەمانەش خێزانەکانی شازادە و بەگزادەکان ڕۆژانە ئامادە دەبوون لە دیوەخانەکەی خێزانی لۆدڤیکۆ، بۆ ئەوەی کاتی خۆیان بە لیۆناردۆوە بەسەر ببەن.

ئەمە کارێکی ئاسان نەبوو بۆ کەسێکی زیرەك و بلیمەتی وەکو لیۆناردۆ، بەڵام ئەوە باجی نزیکبوونەوە بوو لە کۆشکی لۆدڤیکۆ. لیۆناردۆ کەسایەتییەکی بەهێزی نەبوو تاوەکو ئەو کارە گران و ناخۆشانەی لۆدڤیکۆ جێبەجێ نەکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە لیۆناردۆ ئەو کارەی زۆر پێ گران و ناخۆش بوو، بەڵام لیۆناردۆ ئەو کات بەهۆی نزمیی کەسایەتییەکەی هەردەم ڕوویەکی خۆشی پێشانی فەرمانڕەوا و شازادەکان دەدا.

خۆشبەختانە پاش ماوەیەك لۆدڤیکۆ داوای لە لیۆناردۆ کرد بگەڕێتەوە سەر ئەنجامدان و تەواوکردنی پەیکەرەکەی باوکی. لیۆناردۆش بە خۆشحاڵییەوە دوور کەوتەوە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی ژنان و گەڕایەوە سەر کاری ئەنجامدانی پەیکەرەکەی باوکی لۆدڤیکۆ.

دەکرێت بڵێم ئەو هەڵسوکەوتانەی لیۆناردۆ و لۆدڤیکۆ تەواو ڕێك دەکەوێت لەگەڵ بۆچوونی ئەریك فرۆم، لەبەرئەوەی فرۆم پێی وایە کە مرۆڤ لە ڕێگەی چەند شێوازێکدا دەتوانێت خۆی ببەستێتەوە بە جیهان، بەو شێوەیەش ترسی لە تەنیایی و گۆشەگیری نامێنێت. لەو ڕێگەیەشدا لەوانەیە مرۆڤ بۆ تێکەڵاوبوونی بەخەڵك سەر دابنوێنێت لەسەر خود و سەربەخۆیی خۆی، ئەوەش بە ملکەچی بۆ سەرکردە یان یان وڵات، یان ڕێژیم، یان یاسا... هتد. مرۆڤ بەو شێوەیە لە گۆشەگیری ڕزگاری دەبێت و



تابلۆی (سیچیلیا جالیرانی) بووکی لۆدڤیکۆ، ١٤٨٣ ـ ١٤٩٠، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار، ٥٤,٨×٤٠,٣سم (لیۆناردۆ داڤشی)



پۆرترێتی (لۆدڤیکۆ سفۆرزا)، ١٤٩٥، قوماش، میلانۆ.



تابلۆی (مۆزیکژەن)ی دەرباری فرانکینۆ جانۆریۆ، ١٤٩٠، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار، ٤٤,٧×٣٢سم، میلانۆ ـ کتێبخانەی ئەمبرۆزیانا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



پۆرترێتی خاتوونێك، ١٤٨٠، ڕەنگی ڕۆنی شل، میلانۆ ـ ئەمبرۆزیانا. (لیۆناردۆ داڤنشی)

خۆی دەکات بە بەشێك لە هێزێکی گەورە، یان خۆی دەخاتە پاڵ کەسێکی تر، لەبەرئەوەی تەنیا لە ڕێگەی ئەو هێزانەوە هەست بە خودی خۆی دەکات[٤٧].

لیۆناردۆ بۆ سەرکەوتن لە ژیانی و دوورکەوتنەوە لە گۆشەگیری چووە پاڵ لۆدڤیکۆ و چەندین فەرمانڕەوای تر، بۆیە ناچار بوو مل کەچ بکات بۆ زۆر هێز تا لە کۆتاییدا ئامانجەکانی بهێنێتە دی.

داواکردنی لۆدڤیکۆ لە لیۆناردۆ بۆ تەواوکردنی پەیکەرەکەی باوکی لەبەر ئەوەوە بوو کەوا ئاهەنگێکی تری بووك گواستنەوەیان لە پێش بوو، کە بەشوودانی کچە خوشکی لۆدڤیکۆ بوو بۆ شازادەیەکی ئەڵمانیایی. کە لۆدڤیکۆ دەیویست لە ڕۆژی ئاهەنگەکەدا پەردە لەسەر پەیکەرەکەی باوکی هەڵبگیرێت. لیۆناردۆش وای بە باشتر زانی کە لە ڕێوڕەسمی ئاهەنگگێڕانەکە، پەردە لەسەر پەیکەری باوکی لۆدڤیکۆ هەڵبگیرێت.

پاش چەند مانگێکی تری کارکردنی لیۆناردۆ بۆ دروستکردنی پەیکەرەکەی باوکی لۆدڤیکۆ، پەیکەرەکە گەیشتە ئەو قۆناغەی کە لە (گڵێنە) دروست کرابوو، تەنیا ئەو قۆناغانەی مابوو کە بە ئاسن قاڵبێکی بۆ دروست بکات و لە ئەنجامیشدا بە برۆنز دروستی بکات.

بەڵام لۆدڤیکۆ ڕێگەی بە لیۆناردۆ نەدا کە پەیکەرەکەی باوکی بە برۆنز دروست بکات، بگرە لۆدڤیکۆ پێی باش بوو هەر بەو شێوەیەی کە بە قوڕەسۆر دروست کرابوو پەردەی لەسەر هەڵبگیرێت، ئەوەش لەبەر نزیکبوونەوەی کاتی ئاهەنگگێڕانەکە بوو کە ئامانج تێیدا ڕەنگدانەوەی دەسەڵاتی لۆدڤیکۆ بوو.

ئەو ڕۆژەی کە پەردە لەسەر پەیکەرەکەی باوکی لۆدڤیکۆ لادرا جەماوەر و شازادەی ئەڵمانیا گشتیان بە بینینی پەیکەرەکەی باوکی لۆدڤیکۆ سەرسام بوون، هەواڵی مەزنی و شکۆداریی ئەو پەیکەرەی کە لیۆناردۆ دروستی کردبوو لە گشت ئیتاڵیا و زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا دەنگی دایەوە، لە هەموو لایەکەوەش خەڵکی دەهاتن بۆ بینینی پەیکەرەکە. لیۆناردۆ نزیکەی شازدە ساڵ خەریکی دروستکردنی ئەو پەیکەرە بوو، سکێچ و وێنەیەکی ئێجگار زۆری ئەسپ سوارچاکانیشی دروست کردبوو، لە ڕووی توێکارییەوەش لیۆناردۆ لێکۆڵینەوەی زۆری ئەسپ و سوارچاکانیشی دروست

(٤٧) (حماد/ص١٣٩).

کردبوو[٤٨]. بۆیە لیۆناردۆ ئەسپی زۆر خۆش ویست، بەجوامێرترین و جوانترین ئاژەڵی دادەنا[٤٩].

پاش ماوەیەك (جیان)ی فەرمانڕەوای یاسایی میلانۆ بە کتوپڕی دەمرێت و (لۆدڤیکۆ)ش لەلایەن خۆیەوە توانی ئەنجوومەنی (راسپاردە) رازی بکات بەوەی کە بیکەن بە فەرمانڕەوای یاسایی میلانۆ.

لیۆناردۆی خۆشباوەڕ وای زانی ئەگەر لۆدڤیکۆ دەسەڵات بە شێوەیەکی رەها و یاسایی بگرێتە دەست، ئەوا سامان و دەسەڵاتی خۆشی زیاد دەبێت. بەڵام بە پێچەوانەوە کاتێك لۆدڤیکۆ دەسەڵاتی گرتە دەست مووچەی لیۆناردۆی کەم کردەوە و دوای دەخست، لەبەر ئەو هۆیەشەوە لیۆناردۆ بەو رەفتارەی لۆدڤیکۆ زۆر بێزار بوو، بۆیە لیۆناردۆ لە ئەنجامدا بڕیاری دا مان بگرێت و لە کۆشکی لۆدڤیکۆ بڕوات.

بەڵام لۆدڤیکۆ دیسان داوا لە لیۆناردۆ دەکاتەوە لە ساڵی **١٤٩٥** ئەمجارەیان داوا لە لیۆناردۆ دەکات دیواربەندێکی گەورە بۆ هۆڵی چێشتخانەی (برایانی دۆمینیکی پەرستگەی سانتا ماریا دیلا گرتاسیا) لە میلانۆ دروست بکات[٥٠].



سکێچێکی سەرەتایی بۆ ئەنجامدانی مۆنۆمێنتی باوکی (لۆدڤیکۆ سفۆرزا)، ١٤٨٥ ـ ١٤٩٠، ١٤,٨×١٨,٥، ویندسۆر ـ کتێبخانەی شاهانە. (لیۆناردۆ داڤنشی)

(٤٨) (بیتر- موری /ص٢٠٠).

(٤٩) (دیورانت/ص ٢٥١).

(٥٠) (یوسف/ ص٨٤).



نموونەی هێڵکاریی (ئەسپ)، ١٤٩٠،٤,٢١×١٦سم، ویندسۆر ـ کتێبخانەی شاهانە.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



نموونەی هێڵکارییەك لەسەر کاغەز بۆ ئەنجامدانی مۆنۆمێنتی (باوکی لۆدڤیکۆ سفۆرزا)،
١٤٩١، ٢١×١٥، مەدرید.  (لیۆناردۆ داڤنشی)

بابەتی دیواربەندەکەش (دوایین شەوچەرە) بوو. دوایین شەوچەرە لیۆناردۆ لە نێوان ساڵانی (١٤٩٥ تا ١٤٩٨) بەهۆی بیرکردنەوەی زۆر لەو کارە بە پچرپچڕی و سستی کاری تێدا کرد، لەبەر ئەو هۆیەوە سەرۆکی قەشەکانی برایانی پەرستگەی سانتا ماریا دیلا گرتاسیا زۆر پێی سەیر بوو کە هونەرمەند ئەوەندە سەرقاڵی بیرکردنەوە بێت لە چۆنیەتیی بەکارهێنانی فڵچە، بۆیە ئاگەداری لیۆناردۆی کردەوە تا کارەکەی زوو تەواو بکات. سەرۆکی قەشەکان پێی وابوو کە دەبێت وێنەکێش بەردەوام فڵچەی لە دەستدا بێت و کار بکات وەکو کرێکاری کێڵگەکان. بەڵام لیۆناردۆ گوێی لێ نەگرت و بەردەوام بوو لە بیرکردنەوەکانیدا، پاشان گەورە قەشەی پەرستگەی سانتا ماریا دیلا گرتاسیا خۆی گەیاندە لای لۆدڤیکۆ و گلەییی لە سستیی کارکردنی لیۆناردۆ کرد. لۆدڤیکۆش بانگی لیۆناردۆی کرد و پرسیاری هۆکاری تەواونەبوونی دیواربەندەکەی لێ کرد. لیۆناردۆش بە ئامادەبوونی سەرۆکی قەشەکان بە لۆدڤیکۆی گوت کە بلیمەتەکان کەم کار دەکەن و زۆر بیر دەکەنەوە تاوەکو بگەڕێن بەدوای ئەفراندن و نوێخوازی. لیۆناردۆ لە ئەنجامدا بە لۆدڤیکۆی گوت کە سەری دوو کەسایەتی ماوە بیکێشێت یەکێکیان سەری پێغەمبەر عیسایە کە نایەوێت بە دوای نموونەیەکدا بگەڕێت بگرە بە خەیاڵ ئەو شێوە جوان و پاکییە ئاسمانییە پیرۆزە بەرجەستە دەکات. سەرکەکەی تریش سەرکی (یەهودا)یە کە لیۆناردۆ زۆر گەڕابوو بە دوای نموونەی کەسێك ڕوویەکی زۆری لە ناپاکی تێدا ڕەنگ بداتەوە. لیۆناردۆ بۆ گەڕان بە دوای نموونەی یەهودا گوتی: بەڵێن دەدەم هیچی تر بەدوای نەگەڕێم لەبەرئەوەی نموونەی سەری یەهودام دۆزییەوە کە لە شێوەی سەری سەرۆکی قەشەکان باشتر نابینمەوە بۆ بەرجەستەکردنی سەرکێکی ناپاك و سفڵەی وەکو یەهودا. لۆدڤیکۆ زۆر دڵی خۆش بوو بەو رایەی لیۆناردۆ لەسەر سەرۆکی قەشەکان و گوتی: تۆ راست دەکەی. بەڵام سەرۆکی قەشەکان کاتێك گوێی لەو قسانەی لیۆناردۆ بوو شەرم دای گرت و هیچی پێ نەگوترا. بەو شێوەیەش هیچی تر لیۆناردۆی قەڵس نەکرد و لیۆناردۆش لە ساڵی ١٤٩٧ دیسان دەستی بە کارەکەی کردەوە و بە هێمنی کارەکەی تەواو کرد. ئەو کارە هونەرییە یەکێك بوو لە کارە هونەرییە مەزنەکانی لیۆناردۆ کە تاوەکو ئێستاش ناوبانگێکی زۆری لەسەر ئاستی جیهانییەوە هەیە و یەکەمین کاری هونەریی پایەبەرزی سەردەمی ڕێنیسانسیشە.

دواکەوتنی دیواربەندەکە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کەوا لیۆناردۆ دەیویست بەوپەڕی

قوولّییەوە ئەزموونی هونەریی خۆی لەو قۆناغەدا بەکار بهێنێت، بۆیە کارکردن لەو دیواربەندە سروشێکی زۆری لە رووی هزر و ئەزموونی هونەرییەوە تێدا بوو، کە لیۆناردۆ تێبینییەکانی وەکو رەشنووس دەنووسییەوە. ئەگەر تێبینیی تابلۆی (دواین شەوچەرە) بکەین ئەوا سێبەر و رووناکی بەهایەکی سەرەکیی لەو دیواربەندەدا هەیە، ستایلە کلاسیکییەکەی لیۆناردۆ بە شێوەیەك دەرکەوتووە لەو کارەدا کە هێڵی بنمیچە دارەکەی هۆڵەکە درێژ دەبێتەوە تا لە کۆتا دەگات بە خاڵێکی پەنجەرەکە کە دەکەوێتە باگراوندی دیمەنەکە، ئەو رووناکییەی کە لە پەنجەرەکەی پشتی پێغەمبەر عیسا دێتە ژوورەوە وەکو خەرمانەی مانگ بەسەر سەریەوەیە(٥١).

لیۆناردۆ چەندین لێکۆڵینەوەی بۆ ئامادەکردن و ئەنجامدانی ئەو تابلۆیە کرد کە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت لیۆناردۆ گرینگییەکی زۆری بە هونەری روانگە داوە. بەهۆی جووڵە و شێوەی سەرەکیی کەسایەتییەکانی نێو دیمەنەکە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە لیۆناردۆ کاردانەوەی و هەست و سۆزی کەسایەتییەکانی لە کاتێکدا ئەنجام داوە کە هاوەڵەکانی پێغەمبەر عیسا بەسەرسوڕمانەوە سەیری یەکتری دەکەن، لەبەرئەوەی پێغەمبەر عیسا پێیان دەڵێت: "یەکێك لە ئێوە ناپاکیم لەگەڵدا دەکات". بەو شێوەیەش سەرسوڕمان دایان دەگرێت و لە یەکتری دەپرسن کە ئەو ناپاکە کێیە!؟ بۆیە بلیمەتیی لیۆناردۆ لەوەشدایە کە توانیویەتی شێوازێکی شانۆیی و چیرۆکئامێز بۆ دەربڕینی ئەو ساتە ئەنجام بدات.

جگە لەوەش لیۆناردۆ زۆر ماندوو بوو و کاتیشی زۆر پێویست بوو بۆ گەڕان بە دوای رووی کەسایەتییەکان، ئەو ڕووانەی کە هەڵگری لێبووردەیی و چاکەنە وەکو پێغەمبەر (عیسا) و هاوەڵەکانی، لەگەڵ ڕووێك کە هەڵگری ناپاکی و ستەمی هەبێت بۆ ڕووی (یەهودا).

لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی فاکتەری ژینگەیی و بارودۆخی ئەو کاتی میلانۆ... دیواربەندی (دواین شەوچەرە) تا ئاستێکی زۆر تێك چوو، بەڵام پاشان بە هۆی گرینگیی ئەو کارە هونەرییە لە مێژووی هونەریدا چەندین جار لەلایەن شارەزایانی شێوەکاری چاك کراوەتەوە بەشێوەیەك کە دەکرێت بڵێین تێکڕای دیواربەندی (دواین شەوچەرە) ئێستا شوێنپەنجەی ئەو شارەزایانەیە کە چاکیان کردووەتەوە، لەبەرئەوەی

---

(٥١) (علام/ص٨٨).

بریقە و ڕووناکی و کەش و بۆشایی و جووڵەی با کە لە سەرجەم کارە هونەرییەکانی لیۆناردۆدا هەیە لە تابلۆی دوایین شەوچەرەدا ئەو تایبەتمەندییانە نەماوە. سەرەڕای ئەوەش دەتوانم بڵێم ئەو تابلۆیە لە هەندێك بەشیدا هێشتا پارێزگاری لە جوانییە تەڵسماوی و ڕەسەنەکەی خۆی کردووە.

شایانی باسکردنیشە ئەو بەرهەمە هونەرییە مەزنەی (دوایین شەوچەرە) لە وەتەی دروست کراوە تاوەکو ئێستاش قوتابیانی هونەر و هونەردۆستان بە سەرسووڕمان و تێڕامانی قووڵەوە بەرامبەری دەوەستن، بەو هیوایەی کەوا نهێنییەکانی بلیمەتی و ئەفراندنی لیۆناردۆ زیاتر بزانن.

لیۆناردۆ ئەو کاتەی کە لە خزمەتی لۆدڤیکۆدا کاری دەکرد لە پەڕاوی یادگارییە پارێزراوەکانی لە ساڵی ١٤٩٤دا زۆر بە کورتی و شارەوایی نووسیبووی لە ١٦ی



هێڵکارییەکی ماتماتیکی و ئەندازەیی بە تێبینییەوە بۆ دیواربەندی (دوایین شەوچەرە)، ١٤٩٥ ـ ١٤٩٧، قەڵەم، ٢٦×٢١سم، فلۆرانسا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



نموونەیەکی تری هێڵکاری بۆ ئەنجامدانی دیواربەندی (دواین شەوچەرە).
(لیۆناردۆ داڤنشی)



لە قۆناغێکدا نموونەی گرتەیەکی دیواربەندی (دواین شەوچەرە)، ١٤٩٥ ـ ١٤٩٧، ڕەنگی ڕۆنی شل و تەمپەرا، ٤٢٢– ٩٤٠، میلانۆ ـ پەرستگەی سانتا ماریا دیلا گرتاسیا.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



له قۆناغێکدا نموونەی گرتەیەکی تری دیواربەندی (دواین شەوچەرە)، ڕەنگی ڕۆنی شل و تەمپەرا، ٤٢٢× ٩٤٠، میلانۆ- پەرستگەی سانتا ماریا دیلا گرتاسیا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



له قۆناغێکدا نموونەی گرتەیەکی تری دیواربەندی (دواین شەوچەرە)، ڕەنگی ڕۆنی شل و تەمپەرا، ٤٢٢× ٩٤٠، میلانۆ- پەرستگەی سانتا ماریا دیلا گرتاسیا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



وردەکاریی کەسایەتیی پێغەمبەر عیسا لەناو تابلۆی (دواین شەوچەرە).
(لیۆناردۆ داڤنشی)




هێڵکاریی (سەری ئەپۆستێلن یەعقوب و دیزاینی کۆشك و تەلار)، هێڵکارییەکی سەرەتاییە بۆ دیواربەندی (دواین شەوچەرە)، ١٤٩٥ ـ ١٤٩٨، تەباشیری سۆر و قەڵەمی مەرەکەب لەسەر کاغەز، ٢٥,٢×١٧,٢سم، ویندسۆر ـ کتێبخانەی شاهانە. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هۆڵی چێشتخانەی (برایانی دۆمینیکی پەرستگەی سانتا ماریا دیلا گرتاسیا) لە میلانۆ، کە (لیۆناردۆ داڤنشی) دیواربەندی (دواین شەوچەرە)ی لەسەر دروست کردووە

یۆلیۆی ١٤٩٣دا (کاترینا) گەیشت[٥٢].

لەوانەیە خوێنەری ئاسایی وا بزانێت ئەو (کاترینا)یەی کە لیۆناردۆ لە پەڕاوی یادگارییەکانیدا ناوی هێناوە خزمەتکارێکی نوێ بێت و بۆ کارکردن هاتبێتە ماڵی لیۆناردۆ. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە (کاترینا)ی دایکی بوو.

کاترینا پاش مردنی مێردەکەی هەستی بەوە کرد کە ڕۆژەکانی تەمەنی وا کۆتاییان پێ دێت و لە مردن نزیك دەبێتەوە، بۆیە لەگەڵ هەندێك ئافرەتی (تسکانیا) بەشداریی کرد لە گەشتی حەجکردن بۆ (لۆمباریا)، لەوێشدا سەردانی گۆڕی (ئەمبریجیۆی پیرۆز) بکەن. لە کاتی سەردانیکردنەکەیان گەیشتنە میلانۆ، لیۆناردۆش پێشوازییەکی گەرمی لە دایکی کرد، لە باوەشی دایکی هەستی بە هەمان ئەو سۆزەی جاران کرد. دایکی لیۆناردۆ نەیدەویست لە میلانۆ بمێنێتەوە، بەڵام لیۆناردۆ ڕێگەی پێ نەدا بڕوات، لەبەرئەوەی خانوویەکی شیاو و خۆشی بۆ ئامادە کردبوو لە نزیك پەرستگەی (سانتاگیارا) و (دەرگەکانی ڤیرچیلینا). بەڵام بە هۆی ئەوەی کاترینا نەخۆش بوو دەبووایە لەناو جێگەدا پشوو بدات، بۆ ئەوەی نەبێتە بارگرانیش بەسەر ماڵی کوڕەکەی بە داواکەی لیۆناردۆ ڕازی نەبوو. بۆیە لە ئەنجامدا لیۆناردۆ وای پێ باش بوو کە شوێنێکی لە (نەخۆشخانەی مەزن) بۆ ئامادە بکات، کە نەخۆشخانەیەك بوو لە کۆشکە جوانەکان دەچوو. ئەو ماوەیەی کە کاترینا لە نەخۆشخانەی مەزن بوو لیۆناردۆ ڕۆژانە دەچووە سەردانیکردنی، لەگەڵ هەندێشدا هیچ کامێك لە هاوڕێ و قوتابییەکانی نەیاندەزانی کە دایکی لیۆناردۆ لە میلانۆیە. کاترینا لە کۆتاییی ژیانی هەر لە میلانۆ بوو و لە پاش مردنیشی لیۆناردۆ ڕێوڕەسمێکی شایستە و گەورەی بەخاکسپاردنی بۆ ئامادە کرد، کە هیچ لەوە نەدەچوو ئەوە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی ئافرەتێکی کڵۆڵی گوندی بێت.

دەبێت ئەوەشم لە بیر نەچێت بیڵێم لیۆناردۆ پاش ئەوەی کە لە دایکی دوور دەخرێتەوە چەند ساڵێك لە ماڵی باپیری شەوانە دەچووە گوندەکەی دایکی و لە باوەشی دایکی نەبووایە خەوی لێ نەدەکەوت. ئەمە تا ئەو کاتەی کە لە ماڵی باپیری لە (ڤنشی) بوو، بەڵام پاشان کە بۆ خوێندنی هونەری دەچێتە فلۆرانسا ئیدی چیی تر ناچێتەوە گوندەکەی دایکی. لیۆناردۆ هەموو کات ڕووی دایکی لە بیر نەدەکرد، بگرە ڕووی دایکی سروشگەیێنی کارە هونەرییەکانی بوو.

---

(٥٢) (صالح/ص ٣٣).

## پەیکەری سوارچاك فرانچیسكۆ سفۆرزا دەبێتە نیشانەی تیرهاوێژە فرەنساییەكان

بە هۆی ئەو كێشە و گرفتانەی كە لە نێوان لۆدڤیكۆ و وڵاتی فرەنساوە هەبوو؛ لەشكری فرەنسا هێرشی كردە سەر میلانۆ و داگیری كرد، لۆدڤیكۆش میلانۆی جێ هێشت و هەڵات. بەڵام پاشان لۆدڤیكۆ بە دیل دەگیرێت و پاش ١٠ ساڵ لە زیندانێكی فرەنسایی دەمرێت(٥٣).

چارەنووسی ئەو پەیكەرە مەزنەی باوكی لۆدڤیكۆ كە لیۆناردۆ بۆ لۆدڤیكۆی دروست كردبوو، لە كاتی داگیركردنی میلانۆ بووە نیشانەی تیرهاوێژە فرەنساییەكان كە بە گاڵتەكردن و پێكەنینەوە پەیكەرەكەیان تیرباران دەكرد، تاوەكو سەرتاپای قوڕە سوورەكەیان تێك شكاند و پەیكەرەكەیان داڕماند.

لیۆناردۆ بە هۆی ئەوەوەی كەوا سەربازە فرەنساییەكان پەیكەرەكەیان تێك شكاند... زۆر رقی لە سەربازە فرەنساییەكان بووەوە و بە سەربازی هۆڤیكاری دادەنان، لەبەرئەوەی بە بۆچوونی لیۆناردۆ فرەنساییەكان رێز لە بەهاكانی هونەر ناگرن.

بەڵام لە راستیشدا لیۆناردۆ لەو ئاكارەیدا خۆی رێزی لە خۆی و هونەرەكەی و هونەر بە گشتی نەگرتووە، بگرە هونەرەكەی كردبووە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندییە تایبەتییەكانی. لیۆناردۆ تەنیا بۆ نزیكبوونەوە لە دەرباری شازادە و پادشاكان و فەرمانڕەواكان گوێی بەوە نەدەدا كە فەرمانڕەواكە یان شازادەكە چەوسێنەر و تەڵەكەبازە یان بە پێچەوانەوەیە، لیۆناردۆ بۆ بەرژەوەندییەكانی خۆی ئامادە بوو چەكی وا كوشندە دابهێنێت كە مرۆڤی پێوە قڕ بكرێت تاوەكو شازادە و پادشا و فەرمانڕەواكان پارێزگاری لە دەسەڵاتی خۆیانەوە بكەن و دەسەڵاتەكەیان درێژتر و فراوانتر بكەن.

سەیر لەوەدایە لیۆناردۆ لە ماوەی ژیانیدا ویستوویەتی خزمەتی چەندین شازادە و پادشا و فەرمانڕەوا بكات، جاری وا هەبووە لیۆناردۆ خزمەتی فەرمانڕەوایەكی

---

(٥٣) (هان/ص ٦١).

کردووه، پاشان تواناکانی خستووەتە دەستی فەرمانڕەوایەکەی دژی فەرمانڕەوای یەکەم. بۆ نموونە لە میلانۆ ڕەشنووسی هەندێك نامەی لیۆناردۆمان بەرچاو دەکەوێت کە بۆ (دیۆداریۆی سووریایی) جێگری فەرمانڕەوای بابلیۆنی پیرۆز بوو، لە ڕەشنووسەکەدا لیۆناردۆ خۆی وەکو ئەندازیارێك پێشکێش دەکات و بەرگری لە خۆی دەکات و تۆمەتی سستی و تەوەزەلی لەسەرە خۆی لادەبات، باسی ژینگە و جوگرافیای شار و چیاکان دەکات، پاشان باسی کۆتایی ڕووداوێکی مەزن دەکات کە لەوێ ڕووی داوە[٥٤].

ئەوە لەو کاتەیدا بوو کە لیۆناردۆ لە فلۆرانسا بوو زۆر دڵتەنگ بوو لەوەی کە (لۆرنزۆ) لە دەربارى خۆی نزیکی نەدەکردەوە لەبەر ئەو هۆیەوە لیۆناردۆ ئەو کاتی تووشی بێزارییەکی زۆر بووبوو و هەستی بەوە دەکرد کەوا فلۆرانسا بە ڕووی تەسك بووەتەوە. بۆیە لە ڕێگەی هەندێك لە ئەندامە نێردراوەکانی سوڵتانی میسر (قایتبای) کە هاتبوونە فلۆرانسا، هەڵسا بە توویژکردنێکی نهێنی لەگەڵ شازادەیەکی سووری. وتوویژکردنەکەی لیۆناردۆ لەگەڵ سوورییەکان سەبارەت بەوە بوو کە دەیویست خزمەتگوزارییەکانی وەکو گەورە ئەندازیار پێشکێشی حکوومەتی سووریا بکات. لەگەڵ ئەوەشدا کە لیۆناردۆ دەیزانی ئەگەر لەلای سوورییەکان کار بکات دەبێت ئاینی کریستیانی بەجێ بهێڵێت و ببێتە ئیسلام، لیۆناردۆ ئامادە بوو بۆ هەر داواکارییەك کە داوای لێ دەکەن جێبەجێی بکات. لیۆناردۆ ئەو کاتی زۆر حەزی دەکرد فلۆرانسا بەجێ بهێڵێت لەبەرئەوەی هەستی بەوە دەکرد ئەگەر لە فلۆرانسا بمێنێتەوە لەناودەچێت[٥٥].

بۆیە لیۆناردۆ لەو ئاکارەیدا هیچ پرەنسیپێکی یاخیگەری نەبوو دژی فەرمانڕەوا چەوسێنەر و ئەو فەرمانڕەوایانەی کەوا گاڵتەیان بە هونەرەوە دەکرد. لیۆناردۆ سەرەتا پێی وابوو کە لۆدڤیکۆ کەسایەتییەکی چاودێر و سەرپەرشتیارێکی باش دەبێت بۆی، بەڵام لۆدڤیکۆ پیاوێکی بە ورە بوو و حەزی بە گەورەیی دەکرد و زیرەك و دیپلۆماتیش بوو، لە هەمان کاتیشدا کەسایەتییەکی جێگیری نەبوو تا متمانەی پێ بکرێت[٥٦].

(٥٤) (فروید/ص١٠٩-١١٠)

(٥٥) (یوسف/ ص٦٠).

(٥٦) (فروید/ص١٠٠).

لیۆناردۆ خۆشترین کاتەکانی تەمەنی خۆی لە دەرباری لۆدڤیکۆ بەسەر برد، لەژێر خزمەتی لۆدڤیکۆدا مەزنترین کارە هونەرییەکانی، وەکو (دوایین شەوچەرە) و پەیکەری (سوارچاك فرانچیسکۆ سفۆرزا)ی باوکی لۆدڤیکۆی ئەنجام دا.

پاش ئەوەی لیۆناردۆ گوێبیستی مردنی لۆدڤیکۆ دەبێت لە زیندانێکی فرەنسایی، لە پەڕاوی رۆژانەیدا نووسی: میر پۆست و سامان و ئازادیی لەدەست دا، هیچ کامێك لەو کارانەی کە خۆی دەیویست بیکات تەواو ناکرێت.

نەوەکانی پاش لیۆناردۆ رەخنەیان لە لیۆناردۆ دەگرت، بە هۆی ئەوەی کارەکانی خۆی بە تەواونەکراوی بەجێ دەهێشت. لێرەدا لیۆناردۆش هەمان ئەو رەخنەیە لە سەرپەرشتیارەکەی دەگرێت. لەبەرئەوەی لۆدڤیکۆ کارەکانی خۆی پێ تەواو نەکرا. کە ئەمەش وەکو ئەوە وایە لیۆناردۆ ئۆباڵی سەرنەکەوتنی لە کارەکانیدا خستبێتە سەرشانی لۆدڤیکۆ، بۆیە دەتوانم بڵێم لیۆناردۆ کەسایەتیی میری لە شوێنی باوك و رێبەری دانابوو.

پاش تێکشکاندنی پەیکەرەکەی باوکی لۆدڤیکۆ لەلایەن سەربازە فرەنساییەکانەوە، ئەو شازادە فرەنسایییەی کەوا فەرمانڕەوایی میلانۆی گرتبووە دەست، داوای لێبووردنی لە لیۆناردۆ کرد بە هۆی ئەو تاوانەی کە سەربازە فرەنساییەکان دەرهەق بەو پەیکەرەی کە لیۆناردۆ دای هێنابوو کردبوویان. پاشان دیسان فەرمانڕەوا فرەنسایییە نوێیەکەی میلانۆ بۆ جاری دووەم کە چاوی بە لیۆناردۆ کەوت بە لیۆناردۆی راگەیاند کەوا پادشای فرەنسا زۆر خۆشحاڵ دەبێت لە کۆشکەکەی خۆی مێوانداریی بکات، ئەگەر لیۆناردۆ حەزیش بکات لە کۆشکی پادشای فرەنسا ژیان بەسەر ببات، ئەوا پادشای فرەنسا خۆشحاڵتر دەبێت و هەموو ئامرازێکیشی بۆ ئامادە دەکات کە پێویستی پێی دەبێت. بەڵام لیۆناردۆ بە داواکارییەکەی پادشای فرەنسا رازی نەبوو. سەرەڕای ئەوەش کاتێك (لویسی دوازدەم) سەردانی میلانۆ دەکات داوا لە لیۆناردۆ دەکات لەگەڵی بچێت بۆ فرەنسا، پەیمانیشی پێ دەدات کە بیکات بە راوێژکاری سەربازی و ئەندازیار و وێنەکێش و هاوەڵی تایبەتیی خۆی، بەڵام لیۆناردۆ داوای لێبووردنی لێ دەکات بە هۆی ئەوەی کە سروشت و کەشی وڵاتەکەی خۆی زۆر خۆش دەوێت و لەگەڵ هەوەس و تەندروستیی خۆی دەگونجێت، بۆیە لویسی دوازدەم پاساوەکەی لیۆناردۆ قەبووڵ دەکات و فەرمان دەردەکات تا لیۆناردۆ لە

ژیان مابێت دەبێت مووچەیەکی مانگانەی بەردەوامی بۆ ببڕێتەوە[٥٧].

سیستەمی کرێی هونەرمەندان تا کۆتاییی سەدەی پازدە کاری پێ دەکرا، بەڵام لیۆناردۆ مووچەی ساڵانەی وەردەگرت کە لە میلانۆ هەزار (دۆکات) بوو، لە فرەنساش سی و پێنج هەزار (فرەنك)ی وەردەگرت[٥٨].

(٥٧) (الناجحون/ص٩٨).

(٥٨) (علی/ص٥).

بەشی سێیەم

## دەرچوون لە میلانۆ

لیۆناردۆ داڤنشی بە هۆی ئەوەی لە هەوڵەکانی پێشتریدا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە لە ساڵی ١٤٩٩ بڕیاری دا لە میلانۆ دەربچێت. پاش دەرچوونی لە میلانۆ زۆربەی پایەتەختەکانی ئیتاڵیا دەگەڕێت، لە ساڵی ١٥٠٠ دەچێتە دەرباری (ئیزابێلا دێ ئێست) لە (مانتوا) و تەنیا بە هێڵکاری وێنەیەکی ڕووی لە لاتەنیشت بۆ دروست دەکات. پاشان لە ڤینیسیا دەگیرسێتەوە، لەو ماوەیەشدا کە لیۆناردۆ لە ڤینیسیا بوو جوانیی شاری ڤینیسیا زۆر سەرنجی ڕاکێشا.

بە هۆی ئەوەوەی خەڵکی ڤینیسیا ڕێزێکی زۆریان لە تواناکانی لیۆناردۆ دەگرت، لە ئەنجامدا داوایان لێ کرد پلانێکی سەربازی ئامادە بکات بۆ بەرگریکردن لە شارەکەیان دژی هێرشی عوسمانلییەکان. لیۆناردۆ ئەو دەرفەتەی بە هەل زانی تاوەکو تواناکانی خۆی لە بواری سەربازیدا دەربخات. بۆیە کەوتە بیرکردنەوە بۆ چۆنیەتیی داهێنانی ئەو ئامێر و ئامرازە سەربازییانەی کە دەیەوێت ئامادەیان بکات دژی هێرشی سوپای عوسمانلییەکان. بەڵام دیسان لیۆناردۆ نەیتوانی ئامانجەکانی بهێنێتە دی، ئەمەش لەبەرئەوەی دروستکردنی ئەو ئامێرانەی کەوا لیۆناردۆ دەیویست دروستیان بکات پارەیەکی ئێجگار زۆری پێویست بوو، لەلایەکی تریشدا عوسمانلییەکان پلانی خۆیان گۆڕی و هێرشیان نەکردە سەر ڤینیسیا، کە لە ئەنجامدا لیۆناردۆ بڕیاری دا ڤینیسیاش جێ بهێڵێت. بۆیە دەگەڕێتەوە فلۆرانسا پاش ئەوەی کە بۆ ماوەی هەژدە ساڵ بوو لە فلۆرانسا دوور بوو. لیۆناردۆ لە فلۆرانسا لە پەرستگەی (مژدەدان) دەمێنێتەوە، لەبەرئەوەی بەڵێنی پێیان دابوو لە کوشتارگەی گەورە وێنەی (ئانای پیرۆز و پاکیزە و منداڵەکەی لەگەڵ یۆحەنا بە منداڵی)یان بۆ بکێشێت، بۆیە لە ساڵی ١٥٠١دا هێڵکارییەکی لەسەر کاغەز پێشانیان دا، بەڵام هەندێك لە سەرچاوەکان مێژووی ئەو هێڵکارییە بۆ ساڵانی (١٤٧٨ – ١٤٨٠) دەگەڕێننەوە. کە لیۆناردۆ گەڕایەوە فلۆرانسا باوکی پیر بووبوو و تەمەنی گەیشتبووە سەرووی شەست

و پێنج ساڵی[٥٩]، لەو ماوەیەش کە لیۆناردۆ لە فلۆرانسا دوور بوو باوکی ژنی سێیەمی هێنابوو کە ناوی (مارگریتا دێ فرانچیسکۆ) بوو، لەو ژنەی سێیەمیشدا چوار منداڵی لێی بووبوو کە ناویان (جۆلیانۆ– ١٤٧٩، لۆرنزۆ – ١٤٨٤، ڤیۆلانتی – ١٤٨٥، دۆمینیکۆ – ١٤٨٦) بوو. بەڵام ئەو کاتەی کە لیۆناردۆ گەڕایەوە باوکی لیۆناردۆ ژنی سێیەمی مردبوو، ژنی چوارەمی هێنابوو ناوی (لۆکرتسیا کۆرتیجانی) بوو و شەش منداڵی لێ بووبوو، ناویان (مارگریتا – ١٤٩١، بینسیتۆ – ١٤٩٢، پاندۆلفۆ– ١٤٩٤، جۆلیلمۆ – ١٤٩٦، پارتۆلیمیۆ – ١٤٩٧، جاڤانی – ١٥٠٤) بوو[٦٠].

سەرەڕای ئەوەی کە فەرمانڕەواکان گاڵتەیان بە لیۆناردۆ و تواناکانی دەهات بەڵام لیۆناردۆ بە هەر شێوەیەك بووایە سڵی نەدەکردەوە لە پێشکێشکردنی تواناکانی بۆیان، هەر بۆیەشە مێژوونووسان سەیریان بەوە دێت کە لیۆناردۆ[٦١] لە ساڵی ١٥٠٢ دەچێتە (رۆماگنا– Romagna) کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئیتاڵیا، تاوەکو پیشەی ئەندازیاری شەڕ... لەلای فەرمانڕەوایەك بگرێتە دەست کە مێژوو بە فەرمانڕەوایەکی مەترسیدار و تاوانبار ناوی دەبات.

سیزار بۆرژیا ئەو فەرمانڕەوایە بوو کەوا گاڵتەی بە گشت بەهاکانی مرۆڤایەتی دەهات، بۆ بەرژەوەندیی خۆشی سڵی لە هیچ تاوانێك نەدەکردەوە. سیزار بۆرژیا کوڕی پاپای ڤاتیکان (ئەلێکساندەری شەشەم) بوو، بە رەچەڵەك ئیسپانیایی بوو، لە ساڵی ١٤٧٥ یان لە ئەپریلی ١٤٧٦ لە رۆما لەدایك بووبوو. سەرەتا سیزار بۆرژیا بە هۆی پشتگیریی باوکی زۆر بە خێرایی پایە و قۆناغەکانی قەشایەتیی بڕی، تا لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا بووە کاردینال، بەڵام سیزار بۆرژیا هەر زوو پیشەی ئاینگەری جێ هێشت، لەبەرئەوەی زیاتر حەزی لە پلە و پایە و دەسەڵاتی ڕامیاری دەکرد، هەندێك سەرچاوە پێیان وایە کەوا سیزار بۆرژیا لە پشت کوشتنی براکەی خۆی بووە، لەبەرئەوەی براکەی پێشتر لەلایەن باوکییەوە سەرکردایەتیی سەربازەکانی ڤاتیکان و دەسەڵاتی ڕامیاریی پێ سپێردرابوو.

سیزار بۆرژیا لە ساڵی ١٤٩٨ بە بڕیاری شا (لویسی دوازدەم) دەبێتە (دۆك) لە ڤالەنتینۆ، بۆیە پاشان نازناوی سیزار بۆرژیا دەبێتە دۆکی ڤالەنتینۆ. سیزار بۆرژیا

(٥٩) (هان/ ص٦٨).
(٦٠) (داڤنشی/ص٢٤).
(٦١) (علی/ص٦– هان/ ص٧٠– ٧٤).



هێڵکاریی (ئیزابێلا دێ ئێست)، ١٥٠٠، تەباشیری ڕەش و سوور لەسەر کارتۆن، ٤٦×٣٦سم،
پاریس - مۆزەخانەی لۆڤەر. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکارییەکی سەرەتایی (ئانای پیرۆز و پاکیزە و منداڵەکەی لەگەڵ یۆحەنا بە منداڵی)، ١٥٠١، ڕەژوو و تەباشیر لەسەر کارتۆن، ١٤١,٥×١٠٤,٦سم، لەندەن ـ مۆزەخانەی نیشتمانی. (لیۆناردۆ داڤنشی)

ڕاوێژکارێکی هەبوو ناوی (ماکیاڤیلی) بوو. ناوی ماکیاڤیلی تاوەکو ئێستاش لە پاڵ تاوان و پەیمان شکاندن دادەنرێت. بەڵام هەر لە هەمان کاتیشدا بیرمەند و سیاسەتوانێکی زۆر بلیمەت بوو. ئامانجی ماکیاڤیلی لە ڕەفتارەکانیدا جیاکردنەوەی سیاسەت بوو لە کڵێسا. ماکیاڤیلی خاوەنی ئەو گوتە بەناوبانگە بوو کە دەڵێ: "ئامانج پاکانەی ئامرازە- الغایە تبرر الوسیلە"، بۆیە زۆر لەو تاوانانەی کەوا ئێستاش لەلایەن فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدار و تاوانبارەکانیشەوە دێتە ئەنجامدان ڕەهەندەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گوتەیەی (ماکیاڤیلی). بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێم کەوا (ماکیاڤیلی) زەحمەتە پۆلێن بکرێت، یان دەستنیشانی پایەکەی بکرێت، لەبەرئەوەی کەسایەتییەکی دیپلۆمات و مێژوونووس، نووسەری شانۆیی، ژیربێژ.، هزرمەندترین گاڵتەجاڕی سەردەمەکەی بوو، لەگەڵ ئەمانەشدا نیشتمانپەروەرێك بوو بە دوای ئایدیالیزمەوە بوو. دەتوانین بڵێین ماکیاڤیلی پیاوێك بوو لە زۆربەی زۆری پرۆژەکانیدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ کەسایەتییەکانی سەردەمەکەی کاریگەرترین شوێنپەنجەی بەسەر مێژووەوە بەجێ هێشت(٦٢).

سیزار بۆرژیا بۆ جێگیرکردن و فراوانکردنی دەسەڵاتەکەی و یەکخستنی سەرجەم ئیتاڵیا لە یەك قەوارە پرۆسەی سێیەمی پلانەکانی دەست پێ کردبوو، بۆیە پێویستی بە کەسێك بوو کە هێڵکاری و نەخشەی بۆ بکێشێت و قەڵای بۆ دروست بکات، پردی لەسەر ڕووبارەکان بۆ دابمەزرێنێت، ڕێڕەوی ڕووبارەکان بگۆڕێت، لەگەڵ داهێنانی چەك بۆ هێرشبردن و بەرگریکردن. بۆیە لیۆناردۆ ئەو کات لە هەموو کەسێك زیاتر ناوبانگی بەو کارانە دەرکردبوو. سیزار بۆرژیا توانی لیۆناردۆ بانگهێشتن بکات بەشداریی پێ بکات لە پرۆسەی سێیەمی پلانەکەی.

سیزار بۆرژیا بە هۆی ڕووخۆشی و زمانە شیرنیەکەیەوە توانی لیۆناردۆ و ماکیاڤیلی؛ بۆ خۆی رابکێشێت و لە خشتەیان ببات. بۆیە چەندین نازناوی وەکو پیاوی سەردەم و ئەندازیار و داهێنەری لە لیۆناردۆ نابوو، بەو شێوەیەش توانی سوود لە تواناکانی لیۆناردۆ وەربگرێت، سیزار بۆرژیا بۆ فریودانی لیۆناردۆ بە جەنەراڵ یان لیۆناردۆی گەورە بانگی دەکرد، لیۆناردۆ ئەو ناوە سەربازییەی زۆر پێ خۆش بوو. لەبەرئەوەی بە هۆی ئەو نازناوە سەربازییەوە توانی هەموو ئەو شتانەی دەست بکەوێت کە پێویستی پێ بوو بۆ ئەنجامدانی پرۆژە سەربازییەکانی. لیۆناردۆ بە

(٦٢) (دیورانت/ ص٢٨٣).

پشتگیریی سیزار بۆرژیا توانی سەردانی چەندین شوێنی وەکو (ئیموالا، فائیندسا، فلۆرلی، رافنا، ریمینی، بیسارو، ئۆربینۆ، برۆژیا، سینا و چەندین شاری تریش) بکات، لیۆناردۆ ئەو کات لە سنیگالیا بوو کە سیزار بۆرژیا چوار ئەفسەری یاخیی لە دەسەڵاتەکەی خنکاند، ئەو کاتیش بوو لیۆناردۆ شەش نەخشەی گەورەی (ئیتاڵیای ناوەڕاست)ی پێشکێشی سیزار بۆرژیا کرد، کە لە نەخشەکانیدا ڕێڕەوە ئاوییەکان و سروشتی خاکەکەی و بەرزی و نشێوی و دوورییان لە ڕووبارەکان و چیاکان و قەڵا و شارەکانی تێدا ڕوون و دەستنیشان کردبوون. بەڵام ئەو دڵخۆشییەی لیۆناردۆ زۆری نەخایاند لەبەرئەوەی هەر ئەو کات بەکتوپڕی لیۆناردۆ بۆی دەرکەوت کە دەسەڵاتەکەی سیزار بۆرژیا وا خەریکە لەناو دەچێت.

پێشبینییەکەی لیۆناردۆ ڕاست دەرچوو لەبەرئەوەی لە ساڵی ١٥٠٣ باوکی سیزار بۆرژیا (ئەلێکساندەری شەشەم) دەمرێت، بۆیە بە هۆی مردنی باوکی پشتگیری لەدەست دەدات.

پاپای نوێی ڤاتیکانیش (یۆلیۆسی دووەم) سیزار بۆرژیا زیندانی دەکات. پاشان سیزار بۆرژیا لە شەڕێکدا لە ١٢ی مارسی ١٥٠٧ بە دەستی دوژمنەکانی دەکوژرێت و تەرمەکەشی لە کڵێسای سانتاماریا لە ئیسپانیا دەنێژرێت. لیۆناردۆ هەر لەگەڵ لەناوچوونی دەسەڵاتی سیزار بۆرژیا لە ساڵی ١٥٠٣ دەگەڕێتەوە فلۆرانسا.

دەربازبوون لە گۆشەگیری لە ڕێگەی (مازۆخی) و (سادی) یەکگرتنێکی تەواو دروست ناکات، بگرە یەکگرتنێکی ناڕاست دەهێنێتە ئارا کە بە نامۆبوون کۆتا دێت. بگرە یەکگرتن تەنیا لە یەك ڕێگەدا دروست دەبێت کە مرۆڤ لەو کاتەدا دەتوانێت سەربەخۆیی و ئازادی و تەواوکاری بەدەست بهێنێت، کە ڕێگەکەش خۆشەویستییە(٦٣).

کەسایەتیی لیۆناردۆ کەسایەتییەکی (مازۆخی) بوو، کەسایەتیی (سیزار بۆرژیا) یان (لۆدڤیکۆ)... کەسایەتییەکی (سادی) بووە، لێرەدا لیۆناردۆ ئەو ماوەیەی کە لە فلۆرانسا بوو لە پاڵ هیچ فەرمانڕەوایەك نەبوو بۆیە هەستی بە بیمەیی نەدەکرد، بۆیە فلۆرانسای جێ هێشت و چووە لای سیزار بۆرژیا لە ڕۆماگنا. بەیەکەوە هەردوو کەسایەتیی گۆشەگیر لیۆناردۆ و بۆرژیا یەکەیەکیان پێك هێنا کە دەکرێت بڵێم

(٦٣) (حماد/ص١٤٠).

لیۆناردۆ و ماکیاڤیلی کەسایەتیی مازۆخی بوونە هەردەم بە دوای کەسایەتییەکی سادیی وەکو سیزار بۆرژیا گەڕاون. بۆیە پاش لەناوچوونی دەسەڵاتی سیزار بۆرژیا لیۆناردۆ دیسان دەگەڕێتەوە فلۆرانسا. لە فلۆرانساش لیۆناردۆ بۆ ئازادبوون و سەربەخۆبوون، پێگەیشتن و دەربازبوون لە گۆشەگیری بۆ یەکەم جار بوو هەستی بە خۆشەویستی کرد.



نموونەیەکی هێڵکاری و دیزاینی (مەکینەی دروێنە و تانك)، ١٤٩٠، لەندەن - مۆزەخانەی بەریتانیایی. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاری و دیزاینی (تیرهاوێژێکی مەزن) بەتێبینییەوە ، ١٤٩٩، میلانۆ - ئەمبرۆزیانا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



دیزاین و تێبینی بۆ پرۆژەی (ئیموالا)، ١٥٠٢، ڕەنگی ئاوی و قەڵەم و مەرەکەب، ٤٤×٦٠,٢سم، ڤینیسیا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



دۆڵی (کیاناس لە ئاسمانەوە)، ١٥٠٢، ٣٣,٨× ٤٨,٨سم، فلۆرانسا. (لیۆناردۆ داڤنشی)



ئەو وێنەیەی کە گوایە (سیزار بۆرژیا)یە، ١٤٩٩، ئەکادیمیای کرارا

## لیۆناردۆ بۆ یەکەم جار بوو هەستی بە خۆشەویستی کرد

پاش ئەو رووداوە مەترسیدارانەی کە لە زۆربەی شار و میرنشینەکانی ئیتاڵیا روویان دا لیۆناردۆ لە ساڵی ١٥٠٣ دیسان دەگەڕێتەوە فلۆرانسا، لە ساڵی ١٥٠٢ەوە تا سێ ساڵان زۆرترین کاری هونەریی لە ژیانیدا ئەنجام دا(٦٤).

یەکێك لە کارە هونەرییەکانی ئەو کاتی لیۆناردۆ تابلۆی (مۆنالیزا)یە کە لە ساڵی (١٥٠٠- ١٥٠٦) کاری تێدا کرد. تابلۆی مۆنالیزا بەشاکاری کارە هونەرییەکانی لیۆناردۆ دادەنرێت، جگە لەوەش تابلۆی مۆنالیزا بەشاکارێکی مەزنی سەردەمی رێنیسانسیش دادەنرێت.

لیۆناردۆ لە زۆربەی شار و میرنشینەکانی ئیتاڵیا پاش ئەو هەموو رووداوانەی کە بەسەر خۆی و بەرهەمە هونەرییەکانی داهات زۆر دڵی شکا لەو بارودۆخانەی کە روویان دا. بەڵام لەو کاتەدا لە فلۆرانسا لیۆناردۆ چانسێکی زۆری هەبوو بەوەی کە یەکێك لە پیاوە گەورە و دەوڵەمەندەکانی فلۆرانسا (فرانچیسکۆ دێ جۆکۆندا) داوای لە لیۆناردۆ داڤنشی کرد وێنەی ژنەکەی بۆ بکێشێت کە ناوی (مۆنالیزا) بوو.

لیۆناردۆ هەر بۆ یەکەم جار کە چاوی بە مۆنالیزا کەوت پێی سەرسام بوو، لەبەرئەوەی یەکەم جاری بوو هەستی بە خۆشەویستی کرد. ئەو کاتی لیۆناردۆ تا ئەو رۆژەی کە مۆنالیزای بینی بێ خۆشەویستی و ژنهێنان ژیانی بەسەر بردبوو. زۆر گومان لەوە دەکرێت کەوا رۆژێك لە رۆژان لیۆناردۆ هیچ پێوەندییەکی خۆشەویستیی لەگەڵ ئافرەتێکدا هەبووبێت. ئەو کاتەشی کە لیۆناردۆ لە ماڵی ڤیروکیۆی مامۆستاکەیدا دەژیا لەگەڵ قوتابییە بەتەمەن بچووکەکان دەمایەوە بۆیە بە ناوازی رەگەزی تۆمەتبار دەکرا. بەڵام لە راستیدا لیۆناردۆ بەو شێوەیە نەبوو. لەوانەیە هۆکاری ئەو تۆمەتبارکردنەش بە هۆی ئەوەوە بێت کەوا لیۆناردۆ رواڵێکی وەکو مۆدێل بەکار دەهێنا کە ناوبانگێکی خراپی هەبوو. لیۆناردۆ کە دەبێتە مامۆستای هونەریش چەندین کوڕی رواڵ و گەنجی جوانی کردە قوتابیی خۆی، دوایین قوتابیشیان (فرانچیسکۆ میلزی) بوو کە پاشان لەگەڵ لیۆناردۆ چووە فەرەنسا و تا

---

(٦٤) (یوسف/ ص٩٣).

لیۆناردۆش مرد هەر لەگەڵیدا بوو و بووە میراتگریشی(٦٥).

بارودۆخی لیۆناردۆ فێری زۆر شتمان دەکات، بۆ نموونە خۆشەویستی نەکەین تا بە تەواوی لە خۆشەویستی تێ دەگەین، بۆیە دواکەوتن لە پرۆسەی خۆشەویستی زیانگەیێن بووە بۆ لیۆناردۆ، ئەو کاتەشی کە مرۆڤ زانیاریی تەواوی دەبێت ناتوانێت لە یەك کاتدا خۆشەویستی و رق ئەنجام بدات، لەبەرئەوەی لە قۆناغی خۆشەویستی و رق تێ پەڕیوە، لیۆناردۆش لە جیاتیی ئەنجامدانی خۆشەویستی گەڕانی ئەنجام داوە. لەوانەیە هەر لەبەر ئەو هۆکارەش بووبێت ژیانی لیۆناردۆ بە بەراورد لەگەڵ سەرجەم هونەرمەندە گەورەکانی تر هەژارتر بووبێت لە ڕووی خۆشەویستییەوە(٦٦).

بە گوێرەی ئەو سەرچاوانەی کە لە بەردەستدانە لیۆناردۆ هەردەم ئامادە بوو بۆ نزیکبوونەوە لە دەربار، ئەوا فەرمانڕەواکان هەر چ شتێکیان داوا لێ کردبایە بۆیانی جێبەجێ دەکرد.

لیۆناردۆ زۆر حەزی لە هونەر و زانست دەکرد، بەڵام زۆربەی کاتەکان ئەو کاتانە دەستی بە هونەر کردووەتەوە کە فەرمانڕەواکان داوایان لێ کردووە، یان ئەو کاتانەی کەوا شکستی دەهێنا لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانی. وەکو گوتمان پاش ئەوەی میلانۆ داگیر دەکرێت لەلایەن فرەنساییەکانەوە لیۆناردۆ لەساڵی ١٤٩٩ لە میلانۆ دەردەچێت و لەو ماوەیەشدا زۆربەی پایەتەختەکانی ئیتاڵیا دەگەڕێت، تا پاشان دەچێتە فلۆرانسا و لە ساڵی (١٥٠٠ و ١٥٠١) دەست بە دروستکردنی تابلۆی مۆنالیزا دەکات، بەڵام لە ساڵی ١٥٠٢ دەست لە دروستکردنی تابلۆی مۆنالیزا هەڵدەگرێت ئەوەش بە هۆی ئەوەی دەچێتە رۆماگنا تاوەکو ببێتە ئەندازیاری شەڕ لەلای سیزار بۆرژیا. بەڵام پاش کوژرانی (سیزار بۆرژیا) لیۆناردۆ لە ساڵی ١٥٠٣ دەگەڕێتەوە فلۆرانسا، بە پاساوی ئەوەی فلۆرانسا ئەو کات لەباری شەڕدا بوو لەگەڵ (بیزا).

ئاخۆ شەڕ لیۆناردۆی گەڕاندەوە بۆ شارەکەی؟، یان لیۆناردۆ بە هەلی زانی بگەڕێتەوە بۆ دروستکردنی ئەو کەرەستە جەنگییانەی کە دیزاینیانی بۆ کێشابوو. یان خەڵکی فلۆرانسا خۆیان داوایان لە لیۆناردۆ کرد بگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو ئامێرانەیان بۆ دروست بکات، تا لە شەڕە چاوەڕوانکراوەکەیان سوودی لێ وەربگرن.

---

(٦٥) (فروید/ص٢٥).

(٦٦) (فروید/ص٣٠).

لیۆناردۆ کە گەڕایەوە فلۆرانسا پرۆژەیەکی پێشکێشی ئەندامانی ئەنجوومەنی دەسەڵاتداری کرد بۆ گۆڕینی ڕێرەوەی رووباری (ئۆرنۆ)، کە بەناو شاردا تێ دەپەڕی، پاشان بۆ رۆئاوا بە شاری (بیزا)دا تێ دەپەڕی. لیۆناردۆ لە پرۆژەکەیدا وای بە باش زانی کەوا ئاراستەی رووباری ئۆرنۆ بگۆڕێت، بە شێوەیەك کە نەچێتە شاری بیزای دوژمنی فلۆرانسا. بۆیە ئەندامانی ئەنجوومەنی دەسەڵاتداری فلۆرانسا بە تێکڕای دەنگیان رازی بوون بەو پرۆژەیەی کە لیۆناردۆ پێشکێشیانی کردبوو.

پرۆژەکەی لیۆناردۆ دەستی پێ کرد، بەڵام کارەکە زۆر بە سستی ئەنجام دەدرا، بۆیە لیۆناردۆ بیری لەوە کردەوە ئامێرێك دابهێنێت تاوەکو پرۆژەکەی خێراتر تەواو بێت. پاشان لیۆناردۆ ئامێرەکەی دروست کرد و پرۆژەکەش خێراتر ئەنجام دەدرا.

بەڵام بەر لەوەی لیۆناردۆ پرۆژەکەی تەواو بکات هەردوو شاری (فلۆرانسا) و (بیزا) رێککەوتنی ئاشتییان مۆر کرد. بە هۆی رێککەوتنی ئاشتی لە نێوان فلۆرانسا و بیزا پرۆژەکەی لیۆناردۆ بەیەکجاری راگیرا و ماندووبوونەکەشی بەفیڕۆ چوو. بەڵام لیۆناردۆ بیری لەوە کردەوە کە بە شێوەیەکی تر سوود لە پرۆژەکەی وەربگیرێت، بە شێوەیەك کەوا چەند رێگە و جۆگەیەکی تر رابکێشن تا وەکو ئاوی رووباری ئۆرنۆ دابەش بکرێتە سەر شار و شارۆکە و دێهاتەکانی سەر بە شاری فلۆرانسا، کە لە ئەنجامدا گشت جۆگەکان بچێتە شاری بیزا. بەڵام بە هۆی زۆریی تێچوونی پارەوە ئەنجوومەنی دەسەڵاتداری فلۆرانسا رازی نەبوو لەسەر ئەنجامدانی پرۆژەکە.

بە هۆی ئەنجامدانی بەشێکی زۆری پرۆژە تەواونەکراوەکەی لیۆناردۆ، لە وەرزی زستاندا لافاو هەڵی کرد، کە لە ئەنجامدا خانوو و کشتوکاڵی سەدان جووتیار تێك چوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە کارەساتەکە رووداوێکی سروشتی بوو، بەڵام خەڵك لیۆناردۆیان بە تاوانبار زانی. هەر بۆیەشە لە ساڵی ١٥٠٦ لیۆناردۆ بڕیاری دا فلۆرانسا بەجێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە شوێنی لەدایکبوونی لە شارۆکەی (ڤنشی).

لیۆناردۆ پاش گەڕانەوەی بۆ شارۆچکەی (ڤنشی) یادگارییەکانی خۆی بەبیر هاتەوە، کە لە هەمووشیان گرینگتر ئەوە بوو کەوا دیسان بیری لە (فڕین) کردەوە، بۆیە لیۆناردۆ هەوڵی دا باڵەفڕ دابهێنێت.

ئەو هەوڵە سەرەتاییانەی لیۆناردۆ بۆ چۆنیەتیی فڕین بە ئاسماندا دەتوانم بڵێم تا ئاستێك یەکێك بووە لەو هەوڵە سەرەتاییانەی مرۆڤ بۆ داهێنانی ئامرازێك کە بە

هۆیەوە بتوانێت بفڕێت. لیۆناردۆ لە شارۆکەی (ڤنشی) ڕۆژانە دەچووە بازاڕ تاوەکو باڵندە بکڕێت و بیفڕێنێت. خەڵکیش سەریان سوورمابوو لەو کردەوەیەی لیۆناردۆ، لیۆناردۆیان بە گێل دادەنا.

بەڵام مەبەستی لیۆناردۆ لەو کارەیدا ئەوە بوو کەوا بتوانێت ئامێرێکی وا دابهێنێت تاوەکو مرۆڤ بتوانێت بفڕێت، هەر لەبەرئەوەش بوو لیۆناردۆ باڵندەی دەکڕی و دەیفڕاند. شەمشەمەکوێرە و ئەو زیندەوەرانەشی دەگرت کە توانای فڕینیان هەبوو، تاوەکو سەیری باڵ و ماسوولکەکانیان بکات. کە چۆن دەتوانن بفڕن. لیۆناردۆ لە یاداشتەکانیدا نووسیبووی ئەو باڵندە مەزنە بۆ یەکەم جار بەرز دەبێتەوە و دەفڕێت، لەسەر پشتی سەقاقووشێکی مەزن. جیهان بە شێوەیەك پێیەوە سەرسام دەبێت. کە شوێنی داهێنانەکەی تۆمارەکانی مێژوو پڕ دەکاتەوە لە ناوبانگی و شکۆدارییەکی نەمر[٦٧].

لیۆناردۆ پێشتر کە لە (میلانۆ)ش بوو تاقیکردنەوەی لەسەر فڕین ئەنجام دا بەڵام هەر سەرنەکەوتوو بوو، بەڵگەش بۆ ئەوە لیۆناردۆ لە ژیانیدا ئەو تاقیکردنەوە و زۆربەی زۆری تاقیکردنەوەکانی تریشی لە پەراوی تێبینییەکانی دەنووسییەوە.

لیۆناردۆ ئەو مافەی بە خۆی نەدەدا کە ژیان لە ئاژەڵ بسێنێتەوە، بۆیە گۆشتی نەدەخوارد، کە باڵندەشی دەکڕی پاشان دەیفڕاند کە ئەوەش بووبووە سەرچاوەیەکی خۆشی بۆی. لیۆناردۆ پرۆتێستی شەڕ و ڕژانی خوێنی دەکرد، مرۆڤیشی بە پادشای جیهانی ئاژەڵ دانەدەنا... بگرە مرۆڤی بە دڕندەترین ئاژەڵ دادەنا. بەڵام ئەو بیروڕایەی ڕێگر نەبوو لەوەی بە دوای تاوانبار و تۆمەتباراندا بڕوات کە بە مەقسەڵە لەدار دەدران، ئەوەش بۆ لێکۆڵینەوە بوو لە ڕووە ترساوەکانیان، کە لیۆناردۆ لەو کاتەدا سکێچیانی دروست دەکرد[٦٨].

---

(٦٧) (هان/ ص٩٨).

(٦٨) (فروید/ص٢٣).



هێڵکارییەکی سەرەتایی و تێبینییەکانی لیۆناردۆ لەسەر (باڵێکی دەستکرد)،١٤٩٣ ـ ١٤٩٥،
تەباشیری ڕەش و قەڵەم و مەرەکەب، ٥٠×٣٠سم



بەشێك لە لاپەڕەی سێکێچ و تێبینییەکانی لیۆناردۆ بۆ (هەلیکۆپتەر)، ١٤٨٧ ـ١٤٩٠،
فرەنسا ـ پەیمانگەی فرەنسایی



(هەلیكۆپتەر) پڕۆژە و دیزاین و تاقیكردنەوە لەسەر (فڕین). (لیۆناردۆ داڤنشی)



پڕۆژە و دیزاین و تاقیكردنەوە لەسەر (فڕین). (لیۆناردۆ داڤنشی)



پڕۆژە و دیزاین و تاقیكردنەوە لەسەر (فڕین). (لیۆناردۆ داڤنشی)



پڕۆژە و دیزاین و تاقیكردنەوە لەسەر (فڕین). (لیۆناردۆ داڤنشی)



پڕۆژە و دیزاین و تاقیكردنەوەكان لەسەر (فڕین). (لیۆناردۆ داڤنشی)



(هەلیكۆپتەر) پڕۆژە و دیزاین و تاقیكردنەوەكان لەسەر (فڕین). (لیۆناردۆ داڤنشی)



سکێچی لەداردانی تاوانبارێك. (لیۆناردۆ داڤنشی)

دەبێت ئەوەش بڵێم کە لیۆناردۆ دەیویست توندترین چەکی کوشندەی هێرشبردن دابهێنێت و بووبووە سەرۆکی ئەندازیارانی سەربازیش لەلای سیزار بۆرژیا. لیۆناردۆ لە زۆربەی کاتەکانی ژیانیدا چاکە و خراپەی پێ گرینگ نەبووە. بۆیە تاوەکو ئێستاش هیچ کەسێك تەنانەت یەك رستەشی نەدۆزیوەتەوە کە لیۆناردۆ رەخنە یان لایەنگیری رووداوەکانی ئەو سەردەمی کردبێتن. بۆیە دەتوانم بڵێم لیۆناردۆ هەر لە ساڵی ١٥٠١ کاریگەرییەکی زۆری بیرمەند ماکیاڤیلی کەوتبووە سەر(٦٩).

لیۆناردۆ پاش کوژرانی سیزار بۆرژیا بە هەر پاساوێك بێت لە ساڵی ١٥٠٣ گەڕاوە فلۆرانسا و لە پاڵ ئەنجامدانی پرۆژە ئاودێرییەکەی، تابلۆی مۆنالیزاشی ئەنجام دەدا. لیۆناردۆ دیسان دەستی بە کاری هونەری کردەوە کە یەکێکیان شاکاری مۆنالیزا بوو. بۆیە ئەنجامدانی تابلۆی مۆنالیزا بە دوو قۆناغ بووە، لە قۆناغی یەکەمدا مۆنالیزا ئەو کات تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو، ناوقەدی لاواز بوو و لە تەمەنی گەنجێتیدا بوو و هێشتا پێ نەگەیشتبوو، بە هۆی لەدەستدانی منداڵەکەشی خەمبارییی پێوە دیاربوو، بە پێچەوانەی قۆناغی دووەمی کارکردنی لیۆناردۆ لەبەرئەوەی پاش گەڕانەوەی لیۆناردۆ لە رۆماگنا گۆڕانکاری لە جەستەی مۆنالیزا دروست بوو، جەستەی تێروپڕ بووبوو و زیاتر لە ئافرەتێکی پێ گەیشتوو دەچوو، خەمبارییشی بۆ منداڵە لەدەستچووەکەی تۆزێك رەوی بووەوە و زەردەخەنەیەکی لە روویدا بەدی دەکرا کە پاشان لیۆناردۆ بۆ ئەنجامدانی تابلۆی مۆنالیزا ئەو گۆڕانکارییانەشی رەچاو کرد.

لیۆناردۆ لە نووسینێکیدا دەڵێت: مرۆڤ مافی خۆشەویستیی نییە لە کاتێکدا رقی لە شتێك بـبێتەوە، تا ئەو کاتەی زانیاریی تەواوی لەسەر سروشتی خۆشەویستی دەبێت(٧٠).

مۆنالیزای شۆخ و شەنگ هەرکە بۆ یەکەم جار چاوی بە لیۆناردۆ کەوت کاریگەرییەکی ئێجگار زۆری کردە سەر لیۆناردۆ. رووی پێدانی خۆشەویستی و پاکی و بێگەردیی مۆنالیزا بە شێوەیەك بوو کەوا لیۆناردۆ لە ژیانیدا لە شێوەی ئەو رووەی مۆنالیزای نەدیبوو.

لیۆناردۆ زۆر بە پەرۆشی و بە خۆشییەوە دەستی بە وێنەکێشانی مۆنالیزا کرد.

---

(٦٩) (دافنشی/ص٣٣).

(٧٠) (فروید/ص٢٧).

هەموو بەیانیان لیۆناردۆ دەچووە کۆشکی مۆنالیزا لەسەر قوماش وێنەی مۆنالیزای دەکێشا، کاتەکانی رۆژی بە تێرامان و لێ وردبوونەوە لە رووی مۆنالیزا بەسەر دەبرد. لیۆناردۆ لەو کاتانەی کە وێنەی مۆنالیزای دەکێشا مۆنالیزای بە تیپێکی موزیکی دەورە دەدا، تا موزیك بژەنن و مۆنالیزا هەست بە بێزاری نەکات تاوەکو هەموو کات ئەو زەردەخەنە شاراوەی لەسەر لێوان بێت کە لیۆناردۆ خستبوویە سەر تابلۆکەی.

لەوانەیە ئەو زەردەخەنە شاراوەیەی لیۆناردۆ بە هۆی ئەوەوە بێت کەوا شتێك لە گیانیدا زۆر لەمێژ بوو نووستبوو یان بزر بووبوو. ئەوەش بێگومان یادگارییە کۆنەکانی بوو، کە لەلای زۆر گرینگ بووە، تەنیا بە لە خەو هەڵسانی ئەو یادگارییانە یان دۆزینەوەی یادگارییەکان بە بیری هاتبووەوە. بۆیە لیۆناردۆ دەبایە هەرگاڤ دەربڕینی نوێی بۆ ئامادە بکات. ئەگەر لە کارە هونەرییەکانیدا سەرکی منداڵەکان کەسایەتی خۆی دەردەبڕی، ئەوا ئەو ئافرەتانەشی کە لەنێو کارەکانیدا پێ دەکەنن رووی (کاترینا)ی دایکی دەردەبڕن. هەروەکو تابلۆی (ئانای پیرۆز و ماری و پێغەمبەر عیسا) کە لەو تابلۆیەدا (زەردەخەنە) تایبەتییەکەی لیۆناردۆ زۆر بە جوانی لە سەرکی دوو ئافرەتەکەدا رەنگ دەداتەوە(٧١).

بۆیە لێرەدا دەتوانین هەست بەوە بکەین کە لەوانەیە ئەو زەردەخەنە شاراوەیەی مۆنالیزا زەردەخەنەی دایکە لەدەستچووەکەی بێت کە لە رووی ئەو خاتوونە فلۆرانسایییە دۆزیبوویەوە. بە تایبەتیش پاش ئەوەی کە لیۆناردۆ زانی مۆنالیزا لە تەمەنی شازدە ساڵی لە ساڵی ١٤٩٥ مێردی کردووە، لە سەرەتای ساڵانی مێردکردنیدا منداڵێکی بووبوو و لێی بزر بووە(٧٢).

پێشتر کاترینا بە روو و پێکەنینە جوانەکەی یاریی لەگەڵ ئەندێشەی لیۆناردۆوە کردبوو، گیان و دڵی سەرقاڵ دەکرد، تاوەکو لیۆناردۆ لە یاداشتەکانی نێو کتێبەکەی لەبارەی وێنەکێشانەوە نووسیبووی: تێبینیت نەکردووە ئەو ئافرەتە جلوبەرگ زبرانەی کە بەسەر چیاکان دەکەون سەرنج راکێشترن و جوانی و ناسکی و ژیان زیاتر دەدەنە مرۆڤ، بە پێچەوانەی ئەو ئافرەتانەی کە ئاوریشم و گەوهەریان لە بەردایە(٧٣).

---

(٧١) (فروید/ص٨٦ – ٨٧)

(٧٢) (یوسف/ ص٩٩)

(٧٣) (یوسف/ ص٣٣)

لیۆناردۆ ئەو چەند مانگەی کەوا خەریکی وێنەکێشانی مۆنالیزا بوو، هەر بە ئەنقەست بەسستی کارەکەی ئەنجام دەدا، تاوەکو لە چێژی بینینی مۆنالیزای شۆخ و شەنگ بێبەش و دوور نەبێت. بەڵام لە ئەنجامدا مێردی مۆنالیزا هیچی تر خۆی پێ ڕانەگیرا و فەرمانی بە لیۆناردۆ دا کەوا لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا تابلۆکەی بۆ تەواو بکات.

لیۆناردۆ زۆر خەمی لە فەرمانەکەی مێردی مۆنالیزا خوارد، لەبەرئەوەی ڕۆژە خۆشەکانی نزیك دەبوونەوە لە کۆتاهاتن، بەڵام لیۆناردۆ توانی چەند پاساوێك بدۆزێتەوە تاوەکو تابلۆی مۆنالیزا لەگەڵ خۆی ببات، بۆ ئەوەی دیمەنێکی سروشتی لە باگراوندی تابلۆکە بکێشێت، کە لە ئەنجامیشدا تابلۆکەی بۆ خۆی برد و نەیدا بە مێردی مۆنالیزا.

شاکاری (مۆنالیزا) کە بە بەناوبانگترین تابلۆی مێژووی هونەر دادەنرێت. لیۆناردۆ بۆ ماوەی سێ ساڵ قووڵ بووەوە لە کارکردن لەو تابلۆیە بەڵام هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن کارکردنی لیۆناردۆ لە تابلۆی مۆنالیزا بە شێوەیەکی پچڕپچڕ بووە لە نێوان ساڵانی (١٥٠٥ تا ١٥١٣) بۆیە دەبینین بەڵگەیەکی سەلمێنراوی تەواومان لە بەردەستدا نییە بۆ مێژووی دەستپێکردنی تابلۆی مۆنالیزا، لەبەرئەوەی هەندێك لە مێژوونووسان مێژووی دەستپێکردنی تابلۆی مۆنالیزا بۆ ساڵی ١٥٠٢ دەگەڕێننەوە، هەندێکی تریش مێژووەکەی بۆ ساڵی ١٥٠٥ دەگەڕێننەوە، بەڵام زۆربەی ڕەخنەگرەکان دەڵێن پێ دەچێت لە نێوان ساڵانی (١٥٠١ و ١٥٠٣) لیۆناردۆ دەستی بەکارکردن کردووە لە تابلۆی مۆنالیزا ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هاتوچۆ و تۆمارەکانی ئەو کاتی لیۆناردۆ[٧٤].

تابلۆی مۆنالیزا یەکێکە لە تابلۆیە هەرە بەناوبانگەکانی مێژووی هونەر و تاکە تابلۆیەکیشە بووەتە ئەفسانە، کە جوانیی ڕووی ئافرەت پێشان دەدات، زەردەخەنەیەکی هێمنی هەیە چەندە سەیری بکەیت ڕەهەندەکانی قووڵتر دەبێتەوە[٧٥].

تابلۆی (مۆنالیزا) بە هەنگاوە سەرەتاییەکانی گۆڕان دادەنرێت لەنێو هونەری شێوەکاریی سەردەمی ڕێنیسانس. گرینگیی ئەو تابلۆیە لەوەدایە کەوا سەردەمی پێش

(٧٤) (علی/ص٦).

(٧٥) (عطیه/ص٥٩).

ڕێنیسانس پیاوانی ئاینیی کڵێسا بە هیچ شێوەیەك ڕێگەیان بەوە نەدەدا کەوا مرۆڤ وەکو کەسایەتییەکی سەربەخۆ لەنێو بەرهەمە هونەرییەکان ڕێز لە جوانی و خودی بگیرێت، تابلۆی مۆنالیزا دەسپێکی ئەو شۆڕشە نوێیە بوو کە بەهای بەخشییە مرۆڤ خۆی(٧٦).

لە تابلۆی مۆنالیزا دوو پارادۆکسی تریش زەق کراوەتەوە کە جوانیی ئافرەت و ئەو باگڕاوندەی کە لە پشتەوەیدا بەدی دەکرێت کە پێکهاتووە لە سروشتێکی هۆڤیانە لە چیای بەردینی ڕەق، ئەو تابلۆیە وردەکارییەکی بێ سنووری تێدا بەکار هاتووە، لەبەرئەوەی کە بەتیشکی (ئێکس) تاقیکردنەوەی لەسەر ئەنجام درا دەرکەوت کە شوێنی هیچ فڵچەیەکی پێوە دیار نییە.

گرینگیی تابلۆی مۆنالیزا لەوەدایە کە لە سەدەکانی پێشتردا کڵێسا تەنیا ڕێگەی بەوە دەدا وێنەی تاوانی ئادەم و حەوا و بەگشتی بابەتە ئاینییەکان بکرێت، ڕەچاوی ڕۆڵی مرۆڤ نەکرێت. بەڵام ئەو تابلۆیە قووڵاییی ئەو شۆڕشە نوێیەمان بۆ دەستنیشان دەکات کە لە سەدەی پازدەدا کرا. بەوەی کە مرۆڤ وەکو قەوارەیەکی سەربەخۆ ڕێزی لێ گیرا و هەر لە هەمان کاتیشدا خود و جوانیشی ڕێزی لێ گیرا. مۆنالیزا ڕوویەکی باشی هەبوو، بەڵام جوانییەکی لە ڕادەبەدەر و زەقی نەبوو، بگرە گرینگییەکەی تەنیا لە بابەتی تابلۆکەیە کە لیۆناردۆ ساڵانێکی زۆر بوو کاری تێدا کرد و سەرجەم توانا و زانیارییەکانی لەو تابلۆیەدا ئەنجام دا(٧٧).

جگە لەمانەش تابلۆی مۆنالیزا نموونەیەکە بۆ تاکایەتیی تەکنیکی لیۆناردۆ، لەبەرئەوەی وردەکارییەکی ناڕوونی تێدا ئەنجام دراوە، ئەو پانتاییانەی کە تێیدا سێبەرن زۆر بە وردی کاری تێدا کردووە تا ئاستێك کە کۆنترۆڵی هەوەسی مۆنالیزاشی کردووە(٧٨).

بە گوێرەی گوتەی (ڤازاری): لیۆناردۆ بۆ چەندین ساڵ سوور بوو لەسەر تەواوکردنی وێنەی (مۆنالیزا)ی ژنی (دێ جیۆکۆندا)ی فلۆرانسایی بەبێ ئەوەی بتوانێت تەواوی بکات، لەوانەیە هەر ئەو هۆکارەش بێت کە لیۆناردۆ کردبووی بە

(٧٦) (عطیە/ص٥٩).

(٧٧) (هان/ ص٩٥).

(٧٨) (صالح/ص ٤٨).

پاساو بۆ ئەوەی کە تابلۆیەکە نەداتەوە خاوەنەکەی، بگرە تابلۆی مۆنالیزا هەر لەلای لیۆناردۆ مایەوە، هەتا ئەو کاتەی کە چووە فرەنساش تابلۆیەکەی لەگەڵ خۆیدا برد[٧٩]، پاشان شا فرەنسیسی یەکەم تابلۆی مۆنالیزای بە چوار هەزار کڕاون کڕییەوە. تابلۆی مۆنالیزا ئێستا یەکێکە لە بەهادارترین گەنجینەکانی مۆزەخانەی (لۆڤەر)[٨٠] و لە پشت دیوارێکی شووشەییی گوللەبەند پارێزراوە[٨١].

(٧٩) (فروید/ص٢٠).

(٨٠) (دیورانت/ ص٢٦٠).

(٨١) (دافنشی/ص٣٣).



ئاپۆڕای جەماوەری بینەری تابلۆی (مۆنالیزا) لە مۆزەخانەی لۆڤەر. پاریس ـ فرەنسا.



قۆناغی یەکەم لە دروستکردنی تابلۆی (مۆنالیزا) ئەو تابلۆیەی کە تەواو نەکرا.

(لیۆناردۆ داڤنشی)



قۆناغی دووەم لە دروستکردنی تابلۆی (مۆنالیزا)، ڕەنگی ڕۆنی لەسەر داری گوێز،
٧٧×٥٣سم، مۆزەخانەی لۆڤەر– پاریس. (لیۆناردۆ داڤنشی)

## لیۆناردۆ داڤنشی و مایكل ئەنجیلۆ

پێوەندیی نێوان هەردوو هونەرمەندی بلیمەت (لیۆناردۆ داڤنشی و مایكل ئەنجیلۆ) بەو شێوەیە دەست پێ دەكات كە رۆژێك لە رۆژان هاوڕێیەكانی مایكل ئەنجیلۆ لە یەكێك لە گۆڕەپانەكان لیۆناردۆ رادەگرن و داوای لێ دەكەن كە ببێتە ناوبژیكار لە نێوان گفتوگۆكەیان لەسەر شاعیری ناوداری ئیتاڵیایی (دانتی ئەلیجاری). سەرەڕای ئەوەی كە لیۆناردۆ دەیزانی مایكل ئەنجیلۆی هاوڕێیان شارەزاییی لەبارەی ئەو شاعیرە مەزنەوە هەیە، بۆیە زۆر بە سادەیی و خۆبەكەمزانییەوە وەڵامیانی دایەوە و گوتی: باشتر وایە لە مایكل ئەنجیلۆ بپرسن، لەبەرئەوەی ئەو باشتر شارەزای دانتی و شیعرەكانیەتی.

مایكل ئەنجیلۆ كە لەنێو كۆمەڵەكە دانیشتبوو هەر ئەوەندەی كە گوێبیستی ئەو وەڵامەی لیۆناردۆ بوو، بە توورەیی و چاوسووركردنەوە هەڵساوە سەرپێ، وای زانی كە لیۆناردۆ گاڵتەی پێ دەكات، بۆیە زۆر بە توورەیی و دەنگێكی بەرزەوە بەرەنگاری لیۆناردۆ بووەوە و گوتی: بۆچی تۆ بۆیان باس ناكەیت؟ ئەی پەیكەرتاشی ترسناك، ئەی ئەو كەسەی كە نموونەی پەیكەری ئەسپێكت دروست كرد و نەتزانی كە چۆن بە برۆنز دایبرێژیت. بەڕاستی خەڵكی میلانۆ بێ مێشك بوون، ئەو كاتەی كە كارێكی وایان بە یەكێكی وەكو تۆ سپارد.

لیۆناردۆ تەنانەت بە یەك وشەش وەڵامی ئەو سووكایەتی پێكردنەی نەدایەوە، بگرە بەبێدەنگی رێگەی گرتە بەر.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش دەبێت ئەوە بگوترێت كەوا لیۆناردۆ داڤنشی روانگەی تایبەتی خۆی هەبوو سەبارەت بە پایە و بەراوردكردنی نێوان هونەرەكان، دەتوانم بڵێم كە بۆچوونەكانی لیۆناردۆ سەبارەت بە وێنەكێشان و پەیكەرتاشی و موزیك و شیعر... دیارترین ئەو بۆچوونانەنە كە لە كتێبەكەی لیۆناردۆ (دەربارەی وێنەكێشان)دا تێبینی دەكرێن. لەبارەی پێك چوواندن و جیاوازیی نێوان شیعر و وێنەكێشاندا لیۆناردۆ پێی وایە: پێوەندییەكی لێكچوو و جیاواز لە نێوان شیعر و وێنەكێشاندا هەیە، كە ئەوەش هەمان پێوەندیە لە نێوان تەنێكی سێبەر و تەنێكی سێبەرتر، لە نێوان خەیاڵ و كاریگەری[٨٢].

بۆیە شیعر دیمەنێك لە رێگەی پیت و وشەدا پێشان دەدات، بەڵام وێنە شێوەكان بە

(٨٢) (دافنشی/ص٤٦).

جـۆرێکـی کـەتـوار دەخـاتـە بـەرچـاو. بـەو شێوەیـەش چـاو پێشوازی لـە شێوە لێکچووە کەتوارەکان دەکات کە وێنە وەکو سروشتی خۆی دروستی دەکات. بەڵام شیعر لە توانایدا نییە سروشت وەکو خۆی دروست بکات، لەبەرئەوەی وێنەی شیعر هەژارە لە رووی لێکچوواندن، وەکو وێنەکێشان لە رێگەی هەستەوەری بینین ناچێتە ناو ویژدان. بۆیە لیۆناردۆ پێی وایە کەوا بەهای وێنە لە شیعر بەرزترە، بۆ ئەمەش پاساوی ئەوەی هێناوەتەوە کە (وشە)کان دەستکردی مرۆڤن، بەڵام ئەو لێکچوواندنەی کە بە وێنە لەسەر سروشتدا دەکرێت بەرەنجامێکی بەرزتری بەهای کاری هەیە لەو لێکچوواندنەی کە لە وشەکانی مرۆڤدا هەیە[٨٣]... لیۆناردۆ بەردەوام دەبێت لە جیاوازیی نێوان وێنە و شیعردا دەڵێت: وێنە شیعرێکە دەبینرێت، گوێبیستی نابیت. شیعریش ئەو وێنەیەیە کە گـوێبـیستـی دەبـیت و نـایـبـیـنـیت، دەتـوانین بـڵـێین وێنـە و شیـعر دوو جـۆرە وێنـەنـە، هەستیارەکانیان لە نێوان خۆیان دابەش کردووە[٨٤].

لێرەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە لیۆناردۆ هەستیاری بینینی (چاو) لە ئاستێکی بـەرزتـر دادەنـێت لـە هـەستـیـاری بـیستن (گـوێ)، بگرە لیـۆنـاردۆ چـاو بـە گرینگـترین هەستەوەرەکانی مرۆڤ دادەنێت و (گوێ)ش بە پلەی دووەم دێت لە دوای (چاو).

لیۆناردۆ بە گوێرەی نووسینی ئەو تێڕوانینانە و دەربڕینی چەندین رای تریش لـەسەر بـەهـای وێنـەکێشان و شیعردا کـە وەکو دۆکیومێنتێك لـە کتێبـەکـەیدا بۆمـان دەردەکەوێت لیۆناردۆ شارەزاییەکی زۆر باشی لە شیعردا هەبووە. بەڵام بۆ دەربڕینی رای لەسەر شاعیری گەورە (دانتی) لەلای هاورێیەکانی (مایکل ئەنجیلۆ) خۆی وا دەردەخات کە مایکل ئەنجیلۆ باشتر شارەزای شیعرەکانی دانتییە، ئەوە لە کاتێکدا کە شیـعرەکـانـی دانـتـی کـاریگـەرییـەکـی زۆر گـەورەی بـەسەر زۆربـەی رۆشنـبـیرانـی ئـەو سەردەم و ئـێستـاش هـەبـووە، بـگـرە شیـعرەکـانـی دانـتـی وەرچـەرخـانێك بـووە بـەسەر جیهانی شیعر و زانین. بۆیە کەسێکی رۆشنبیری وەکو لیۆناردۆ کە ئاستی بلیمەتیی زۆر مەزن بووە لە چاو کەسی تر جێگەی گومانە کە لیۆناردۆ شارەزاییی لە شیعرەکانی شاعیری گەورەی ئیتاڵیایی (دانتی) نەبێت، بە تایبەتیش کە دانتی خەڵکی فلۆرانسا بـووە، کـاریگـەریشی بـەسەر لـیۆنـاردۆوە هـەبـووە لـەبـەرئـەوەی لـیۆنـاردۆش هـەر وەکو دانتی بە زمانی نەتەوەیی شتەکانی دەنووسییەوە، بگرە سەردەمی رێنیسانس لەسەر دەستی (دانتی)یەوە دروست بوو.

(٨٣) (دافنشی/ص٥١ – ٥٢).

(٨٤) (دافنشی/ص٥٩).

## ململانێی نێوان لیۆناردۆ داڤنشی و مایکل ئەنجیلۆ بە سەرکەوتنی لیۆناردۆ کۆتایی دێت، بەڵام...

دەسەڵاتدارانی فلۆرانسا بڕیاری جوانکاریکردنی بنمێچی هۆڵی ئەنجوومەنی گەورە دەدەن، بۆ ئەمەش رایان دەکەوێتە سەر لیۆناردۆ داڤنشی و مایکل ئەنجیلۆ کە دەبێت یەکێکیان ئەو پڕۆژەیە ئەنجام بدات، بەڵام پاش وتوویژ رایان دەکەوێتە سەر لیۆناردۆ. بۆیە لە ساڵی ١٥٠٣ لیۆناردۆ لەلایەن دەسەڵاتدارانی فلۆرانساوە رادەسپێردرێت کە وێنەیەکی (شەڕی ئەنگیاری) لەسەر بنمێچی هۆڵی ئەنجوومەنی گەورە دروست بکات. بەڵام کە (مایکل ئەنجیلۆ) بەو کارە دەزانێت، ئەویش پڕۆژەیەك پێشکێشی دەسەڵاتدارانی فلۆرانسا دەکات تا رای بسپێرن لە بەشی بەرامبەری بنمێچەکەی هۆڵی ئەنجوومەنی گەورە بابەتی (شەڕی کاسینا) دروست بکات. دەسەڵاتدارانی فلۆرانسا بە پڕۆژەکەی مایکل ئەنجیلۆش رازی دەبن. بۆیە مایکل ئەنجیلۆ بۆ دروستکردنی بابەتی شەڕەکە دیمەنی شەڕکەرەکانی بە رووتی دروست کردووە، ئەوەش بۆ دەرخستنی جوانیی نێرینە و بەرزڕاگرتنی هێز و توانای پیاوان بووە. بەڵام ناوەڕۆکی بابەتی شەڕی ئەنگیاری کە لیۆناردۆ دروستی دەکرد برێتی بوو لەو کاتەی کە شەڕەکە لە لووتکەدا بوو[٨٥].

لیۆناردۆ لە شوباتی ١٥٠٤دا لەسەر دیواری تەلاری (فیکیۆ) دەستی بە وێنەکێشانی (شەڕی ئەنگیاری) کرد[٨٦]، کە ئەو شەڕە لە ساڵی ١٤٤٠ رووی دابوو و سوپای فلۆرانسا سوپای میلانۆ دەشکێنێت، ئەو کارە هونەرییەش لیۆناردۆ لەسەر داواکاری حکوومەتی فلۆرانسا ئەنجامی دا[٨٧]. کە ئەوکات بنەماڵەی میدیتشی لەسەر دەسەڵات نەمابوون[٨٨].

سەرەڕای ئەوەش کە لە هەمان کاتدا ناوەناوە وێنەی مۆنالیزای دەکێشا، بەڵام بۆ وێنەکێشانی شەڕی ئەنگیاری سێ ساڵ بە دوای تەکنیکێکی نوێدا گەڕا. بە هەر

---

(٨٥) (بیتر – موری /ص٢٠٤).

(٨٦) (علی/ص٦).

(٨٧) (الناجحون/ص٨٧).

(٨٨) (علام/ص٨٨).

شێوەیەك بێت دیواربەندەكە كە بە شێوەی (فریسكۆ) كاری تێدا دەكرد تەواو نەبوو، هەتاوەكو ئەو بەشەی كە تەواویش كرابوو بە ماوەیەكی كەم ڕەنگەكانی لەسەر دیوارەكە تێكەڵاوی یەكتری بوون و نەمان. پاش چەند مانگێك بەر لە تەواوبوونی دیواربەندی شەڕی ئەنگیاری مایكل ئەنجیلۆ خۆی پێ ڕانەگیرا و سەرسوڕمانیی خۆی بۆ ئاستی بلیمەتیی لیۆناردۆ دەربڕی؛ بگرە لیۆناردۆی بە مامۆستای خۆی دانا و لە بەرامبەری سەری دانەواند. جگە لە مایكل ئەنجیلۆ خەڵكی فلۆرانساش لە ئەنجامی بینینی ئەو كارە هونەرییە لیۆناردۆیان بە سەركەوتووتر دانا لە مایكل ئەنجیلۆ.

مێژوونووسان هۆكاری تێكچوونی تابلۆیەكە بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە كەوا لیۆناردۆ جۆرە بۆیەكێكی تایبەتی بەكار هێنابوو كە پێشتر ڕۆمانییە كۆنەكان بەكاریان دەهێنا. لیۆناردۆ بۆ دروستكردنی ئەو بۆیەكە سوودی لە كتێبێكی مێژوونووسێكی گریكی بە ناوی (پلین) وەرگرتبوو. لیۆناردۆ كە توندترین ساتی بارودۆخی شەڕەكەی دروست دەكرد؛ دوور كەوتبووەوە لە قەشەنگیی هونەری فلۆرانسایی، بگرە بە شێوەی جووڵەی بەهێز دیمەنی شەڕەكەی دەكێشا. بەڵام پاش تێكچوونی دیواربەندەكەی (شەڕی ئەنگیاری) لیۆناردۆ لەبارێكی دەروونیی خراپدا ژیانی بەسەردەبرد كە لە ئەنجامدا لە وێنەكێشان و فلۆرانساش دووركەوتەوە و زیاتر بایەخی بە جووڵەی باڵندە و كەرەستەكانی فڕین و میكانیزمی (با) دەدا.

لە ساڵی ١٥٠٤ پیێرۆ داڤنشی باوكی لیۆناردۆ لە تەمەنی حەفتاوحەفت ساڵیدا دەمرێت. بۆیە لیۆناردۆ بە هۆی مردنی باوكییەوە هیچ خەمبار نەبوو، لەبەرئەوەی پیێرۆ داڤنشی لەنێو سەرجەم منداڵەكانی تەنیا لیۆناردۆی لە میرات بێبەش كرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (فرانچیسكۆ)ی مامی لیۆناردۆ بە هۆی پەرۆشیی بۆ لیۆناردۆ سەرجەم سامانەكانی خۆی بۆ تۆمار كرد(٨٩).

بە هۆی ئەوەی (فرانچیسكۆ)ی مامی لیۆناردۆ تەواوی سامانەكەی بۆ لیۆناردۆ كردبووە میراتی ناكۆكییەكی زۆر كەوتە نێوان لیۆناردۆ و برایەكانی. باوكی لیۆناردۆ كە مرد لیۆناردۆی بێبەش كرد لە میراتی بۆیە فرانچیسكۆی برای وەكو كاردانەوەیەك دژی ئەو نادادپەروەرییە لیۆناردۆی كردە میراتگری خۆی(٩٠).

بۆیە لیۆناردۆ بە هەڵسوكەوتە نابەجێكانی برایەكانی زۆر دڵتەنگ دەبێت و بڕیار

(٨٩) (هان/ ص٨٣).

(٩٠) (مراد/ص١٢٢).

دەدات فلۆرانسا جێ بهێڵێت، لە ساڵی ١٥٠٨یش دەچێتە میلانۆ.

بێگومان هەر هەنگاوێکی زانست و زانیاری سەرەتا بە هەنگاوێکی سادە دەست پێ دەکات و بە کۆمەڵێك کۆسپ و تەگەرەوە تێ دەپەڕێت کە لەوانەیە کەسە زاناکە بە هۆیەوە دووچاری نائومێدی ببێت، بەڵام هەنگاوی سەرەتاییی هەر زانایێك بە هەوێنی داهێنانی زانست و هونەرەکان دادەنرێت.

پێشکەوتنی زانست لەم سەردەمە و لە سەردەمەکانی پێشتریشدا لە گشت رووەکانەوە بۆ هەوڵی ئەو زانا بلیمەتانە دەگەرێتەوە کە بۆ یەکەم جار هزر و بۆچوون و تیۆرەکانیان خستە خانەی تاقیکردنەوە. ئەگەرچی داوونەریت و رۆژگار، کەمی و نەبوونی کەرەستە تا ئاستێکی زۆر رێگر بوون لە بەردەم داهێنانەکانیان، بەڵام خۆ بیریان لە شتە سەرسوڕهێنەرە زانستییەکان دەکردەوە، کە ئەو کات خەڵکانی تر بە گشتی نوقمی نەزانی بوون.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش لیۆناردۆ هەموو تێبینی و بۆچوونە زانستییەکانی بە زمانی نەتەوەکەی دەنووسییەوە، بەتوندی دژی زمانی لاتینی بوو، دەیگوت: لەناو زمانەکەی خۆمدا ئەوەندەم وشە هەیە زۆر لەوە زیاترن کە بتوانم دەربڕینیان لە شتەکان پێ بکەم و ناوەڕۆکی بیروڕاکانمیان پێ دەرببڕم(٩١).

جیا لە بواری هونەر، لیۆناردۆ داڤنشی کارامەیی و بلیمەتییەکی ئێجگار زۆری لە بواری داهێنانە زانستییەکاندا هەبوو. لیۆناردۆ لە پەڕاوی تێبینییەکانیدا نەخشەی چەندین ئامێر و کەرەستەی جۆرەوجۆری کێشاوە کە زاناکان لەم سەردەمەی ئێستادا سوودێکی زۆریان لێوە وەرگرتووە. زانستی توێکاری، دیزاینی چەکە کوشندەکانی وەکو زرێپۆش، نارنجۆك، مووشەك، جلوبەرگی ژێر ئاو، پاپۆڕی ژێر ئاو، دروستکردنی ئامێری هەڵکەندنی زەوی، هەوڵەکانی فڕین، کۆمەڵێك کەرەستە و ئامێری تری زانستی، کە بە هۆی نەبوونی بودجەیەکی پێویست، ئەنجام نەدران. بەڵام دیزاین و هێڵکارییەکان لە پەڕاوی تێبینییەکانی لیۆناردۆ بوونە هۆی ئەوەی کەوا زاناکان بە هۆی لەبارییی رۆژگار و بودجەوە ئەو خەونانەی لیۆناردۆ لەم سەردەمەدا ئەنجام بدەن. لیۆناردۆ لە کتێبەکەیدا توانی بە پیتی گەورە بنووسێت کە (رۆژ ناجووڵێت) و لە شوێنی خۆی جێگیرە(٩٢).

(٩١) (مەزهەر/ل ٩٨).

(٩٢) (فروید/ص٣٢).

بەو شێوەیەش لیۆنارد سەد ساڵ بەر لە گالیلۆ چەند دیاردەیەکی لەبارەی هەڵهاتن و ئاوابوونی مانگەوە دۆزیبووەوە، جگە لەوەش ئەو کاتەی کە ئەمەریکاییەکان یەکەم (تایپ) رایتەریان لە ساڵی ١٨٦٧ داهێنا لیۆناردۆ بەر لە٣٥٠ ساڵ پێشتر نەخشەی بۆ کێشابوو(٩٣).

لیۆناردۆ لە شارۆکەی (ڤنشی)دا دووەم قۆناغی تاقیکردنەوەی لە بواری فڕیندا دەست پێ کرد، بۆیە پاشان لیۆناردۆ وای بە باشتر زانی کە تاقیکردنەوەکانی لەسەر فڕین بگوازیتەوە بۆ فلۆرانسا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیسان سەرکەوتوو نەبوو لە هەڵی فڕین.

لیۆناردۆی زانا و هونەرمەندی بلیمەت دەکرا بە هۆی داهێنانەکانی لە ژیانیدا سەرکەوتووتر بێت، ئەوەندەش تووشی نائومێدی نەبێت لە ئەنجامدانی داهێنانەکانی. سەرچاوە مێژووییەکان ئەوە دەسەلمێنن کە لیۆناردۆ داڤنشی زۆربەی زۆری هەوڵ و تاقیکردنەوە و داهێنانە زانستییەکانی، سەرباری ئەوەی کە بۆ خزمەتی پادشا و شازادە و فەرمانڕەوا زۆردارەکان بووە، بەڵام لیۆناردۆ خۆی ئامانجێکی تری هەبوو، کە خۆ نزیککردنەوە بوو لە شازادە و فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدارەکان. هەر بۆیەشە داهێنانەکانی لیۆناردۆ لەلایەن فەرمانڕەواکان بە (کاڵا) سەیر دەکران. لیۆناردۆ بەو هەڵسوکەوتە هەلپەرستییەی کە دەیکرد پرۆژە زانستی و هونەرییەکانی لەلایەن فەرمانڕەواکاندا بە نزمی هەڵدەسەنگێندرا. سەرباری رۆژگاری نەزانی لەو سەردەمدا، ئەگەر لیۆناردۆ کەسایەتییەکی یاخیی هەبووایە یانیش خۆی دوورەپەرێز بگرتبایە لە فەرمانڕەوا زۆردارەکان لەوانەیە زیاتر سەرکەوتووتر بووایە لە ژیانیدا و هەندێکیش لە پرۆژە هونەرییەکانی باشتر ئەنجام بدابایە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە لیۆناردۆ لە بواری هونەری وێنەکێشاندا زۆر بلیمەت بوو، ئەگەر لە ژیانیدا تەنیا خۆی سەرقاڵی هونەری شێوەکاری کردبا، ئەوا لەوانەیە لە ژیانیدا مرۆڤێکی زۆر سەرکەوتوو بووایە، بەڵام لیۆناردۆ هەر کاتێك هەلی ئەوەی بۆ بڕەخسابایە کە بتوانێت لە دەرباری شازادە و فەرمانڕەواکان نزیك ببێتەوە دەستی لە هونەر هەڵدەگرت، بە جۆرێك لە جۆرەکان هەموو کاتێك لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە بزانێت شازادە و فەرمانڕەواکان چییان پێویستە بۆ ئەوەی بۆیان جێبەجێ بکات.

---

(٩٣) (مەزهەر/ل ٩٩).

سەرەڕای ئەوەش لە زۆربەی زۆری ئەو پرۆژانەی کە خۆی پێشنیازی دەکرد یان داوای لێ دەکرا، بە هۆی سستی لە کارکردن ئەوا لە ئەنجامدا تووشی تێکشکان دەبووەوە.

لیۆناردۆ پاش هەر تێکشکانێك لە بواری زانستدا دەگەڕایەوە باوەشی هونەر، ئەوەش بۆ بەرزکردنەوەی ورەی تێکشکاو و دڵدانەوەی خۆی بوو. بۆیە لیۆناردۆ پاش ئەوەی کە لە پرۆژەی فڕیندا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا گەڕایەوە سەر پیشە کۆنەکەی کە پیشەی وێنەکێشان بوو.



لێکۆڵینەوەیەکی هێڵکاری بە تێبینییەوە لەسەر (ئەستێرەناسی)، ١٥٠٧، ئەم هێڵکارییە لەلای (بیل کیتس)ە. (لیۆناردۆ داڤنشی)



چەند هێڵکاری و سکێچێك بۆ دروستکردنی پرۆژەی دیواربەندی (شەڕی ئەنگیاری).
(لیۆناردۆ داڤنشی)



تابلۆیەکی کۆپیی (شەڕی ئەنگیاری)، کە لەلایان هونەرمەندی گەورە (پیتەر پۆل ڕۆبنز) لەسەر کارتۆن دروست کراوە، ١٦٠٣، ٤٥,٢ ـ ٦٥,٧سم، پاریس ـ مۆزەخانەی لۆڤەر.



تابلۆیەکی کۆپی کراو بۆ (شەڕی ئەنگیاری) کە لەلایان هونەرمەند (تاڤۆلا دۆریا) دروست کراوە، ١٥٠٣ ـ ١٥٠٥، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار، ٨٥×١١٥سم، میوشن ـ لەلای (ساملۆنگ گی . هۆفمان)ە.



کۆپییەکی (شەڕی کاسینا) لەلایان هونەرمەند (باستیانۆ دا سەنگالۆ) یان هونەرمەند (ئەریستۆ)وە دروست کراوە، ١٥٤٢.



هێڵکاری و لێکۆڵینەوەیەکی (لیۆناردۆ داڤنشی) لەسەر چۆنیەتیی فڕینی باڵندەکان



تابلۆی (ئانای پیرۆز و پاکیزە و پێغەمبەر عیسا و بەرخ)، ١٥٠٦ ـ١٥١٣، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار، ١٦٨×١٣٠سم، پاریس ـ مۆزەخانەی لۆڤەر. (لیۆناردۆ داڤنشی)





وردەکارییەکانی ناو تابلۆی (ئانای پیرۆز و پاکیزە و پێغەمبەر عیسا و بەرخ)...
(لیۆناردۆ داڤنشی)

## لیۆناردۆ بۆ لێکۆڵینەوە زانستییەکانی نزیکەی سی تەرم توێکاری دەکات

لە ساڵی ١٥٠٩ لیۆناردۆ تابلۆی (یۆحەنای مۆرکار – معمدانی) تەواو دەکات کە دوایین کاری هونەریی ئەو سەردەمیتی، بەڵام بەهای هونەریی ئەو تابلۆیەی لەلایەنی هێزی پێکهێنان و توێکاری و شێوەی نەرمیی ئەندامەکانی جەستە و زەردەخەنە و سێبەر وەکو کارە هونەرییەکانی پێشتری نەبوو(٩٤).

ساڵی پاش دروستکردنی تابلۆی (یۆحەنای مۆرکار)، واتە لە ساڵی ١٥١٠ لیۆناردۆ سەرلەنوێ توێژینەوەکانی دەست پێ دەکاتەوە. بۆیە لە ساڵی ١٥١٢دا لە چەندین شار و هێزی تردا دەگەڕێت تا سەرپەرشتیی بکات. پاشان لەسەر بانگهێشتنی (جۆلیانۆ دێ میدیتشی) برای پاپای ڤاتیکان (لیۆی دەیەم) لە ساڵی ١٥١٣ دەچێتە رۆما و بۆ ماوەی چوار ساڵ تێیدا نیشتەجێ دەبێت(٩٥).

وەکو گوتم لیۆناردۆ کەسایەتییەکی مازۆخیی هەبوو، بۆیە لەلای (ئەریك فرۆم) کەسایەتیی مازۆخی ملکەچە بۆ کەسێك یان هێزێکی مەزنتری دەرەوەی خۆی، ئەو شێوە مرۆڤە ئازادی و شکۆمەندیی خۆی دەخاتە بەردەستی هێزێکی دەرەکی و لە بەرامبەریشیدا هەست بە بێهێزی و گومڕاییی خۆی دەکات. بۆیە کەسایەتیی مازۆخی ئەگەر هێزێکی دەرەکی سەرپەرشتیی نەکات هەست بە تەنیایی و بێهێزی و نیگەرانی دەکات و هەموو کات خوازیارە لەو تەنیاییە رابکات، ئەو هەستکردنە لە ئەنجامی ئازادییەکی نێگەتیڤدا دروست دەبێت کە مرۆڤ تەنیا دەکات و ڕووبەڕووی جیهانێکی نامۆی دەکاتەوە، بۆیە تاکی مازۆخی دەیەوێت بێتوانایی و هەستکردنی بە تەنیایی لە رێگەی بە قوربانیدانی ئازادییەکەیدا بهێنێتە دی و خودی خۆشی لە دەست بدات، کەسایەتیی مازۆخی گیانی بۆ بەرزڕاگرتن و درێژکردنەوەی بوونەوەرێکی تر بەکار دەهێنێت(٩٦).

---

(٩٤) (علی/ص٧).

(٩٥) (بیتر – موری /ص٢٠٦).

(٩٦) (حماد/ص٩٣ – ٩٤).

ماوەی ئەو چوار ساڵەی کە لیۆناردۆ لە ڕۆما بوو لە ناکۆکیی دەروونی زیاتر هیچ بەرهەمێکی ئەوتۆی نەبوو، ئەوە لە کاتێکدا بوو کە هونەرمەندانی وەکو رافائیل و مایکل ئەنجیلۆ مەزنترین کارە هونەرییەکانیان لەو سەردەمدا ئەنجام دەدا و رکابەرایەتیشیان لەگەڵ لیۆناردۆ دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا کە مایکل ئەنجیلۆ و رافائیل زانستەکانی سێبەر، رووناکی، توێکاری، روانگە، زانیاری لەسەر سروشت و مرۆڤ... لە لیۆناردۆوە فێر بووبوون بەڵام رکابەرایەتییان لەگەڵ لیۆناردۆ دەکرد(٩٧).

ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی مایکل ئەنجیلۆ و رافائیل کارە هونەرییەکانیان کاریگەرییەکی زۆری هونەریی لیۆناردۆی لەسەر بوو. سەرەڕای ئەوەش رافائیل و بە تایبەتیش مایکل ئەنجیلۆ بە خراپە لەلای پاپادا باسیان دەکرد(٩٨).

لیۆناردۆ لەو ماوەیەی کە لە ڕۆما دەبێت چەندین رەشنووس دەنووسێتەوە لەسەر زانستی توێکاری، کە بە زانستێکی جیای دادەنا لە زانستی وێنەکێشان، بۆ ئەو مەبەستەش نزیکەی (سی) تەرم توێکاری دەکات. دەتوانین بڵێین لیۆناردۆ یەکەم کەس بووە کە وێنەی کۆرپەلەی ناو سکی دایك دروست دەکات. لیۆناردۆ وێنە و بابەتی زۆری لەسەر توێکاری ئەنجام داوە لەسەر ناوەڕۆکی جەستەی مرۆڤ کە پێشتر ئاشکرا نەبووبوون. بەڕای (سالمۆن) کە پێی وایە ئەگەر بێتو کتێبەکەی لیۆناردۆ (تیۆری توێکاری) بواری چاپکردنی بۆ بڕەخسابایە لەوانە بوو پایەی یەکەمی گرینگی لە بواری پزیشکی هەبایە. کە بە هۆیەوە دووچاری کێشە و تۆمەتی زۆر بووەوە لەسەر لەتوپەتکردنی تەرمی مرۆڤ، بۆیە ڤاتیکان فەرمانی دەرکرد کە لیۆناردۆ قەدەغەیە بچێتە نەخۆشخانەی (ڤیلا ریتی) لە میلانۆ(٩٩).

لیۆناردۆ یەکەم کەس بوو کە تێبینیی زانستیی زۆر گرینگی لەسەر منداڵدانی ئافرەت نووسییەوە، زۆر بە وردیش باسی ئەو سێ پەردەیەی کرد کە لەناو سکی دایك کۆرپەلەی تێدا دەژیت. لیۆناردۆ یەکەم کەس بووە کە وێنەی ناوەوەی ئێسکی دروست کردووە(١٠٠).

---

(٩٧) (یوسف/ ص١٤٤).

(٩٨) (علام/ص٩٠).

(٩٩) (بهنسی/ ص١٤٧).

(١٠٠) (دیورانت/ ص٢٦٣).



تابلۆی (باکۆس)، ١٥١٠ ـ ١٥١٥، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار بەڵام گواستراوەتەوە سەر قوماش، ١٧٧×١١٥سم، پاریس ـ مۆزەخانەی لۆڤەر، گومان لەوە دەکرێ ئەم کارە (لیۆناردۆ داڤنشی) دروستی کردبێت



تابلۆی (یۆحەنای مۆرکار ـ معمدانی)، ١٥١٣ ـ ١٥١٦، ڕەنگی ڕۆنی شل لەسەر دار،
٦٩×٥٧سم، پاریس ـ مۆزەخانەی لۆڤەر. (لیۆناردۆ داڤنشی)

لــە ساڵــی ١٥١٥ كـڵـێسا پـرۆسەیـەكـی دواكـەوتـوو دەكـاتـە سەر دەستـكـەوتـە شارستانییەكانی ئەو كات، كە لە سەدەی پازدەی سەردەمی ڕێنیسانس جێگیر بووبوو. هـێرش كـرایـە سەر لـیـۆنـاردۆ و لێكـۆڵـینـەوەكـانـی، سەرەڕای ئـەوەش كـەوا لـیـۆنـاردۆ بەرگریی لە خۆی كرد بەوەی سەرتاپای ژیانی پێشكێشی ئیستاتیكا و راستی كردووە، بەڵام هەردەم بە دواوەی بوون. لەبەرئەوەی لیۆناردۆ بە تەواوی لە ڕێوڕەسمەكانی ئاینی كڵێسا دوور كەوتبووەوە، دەبێت ئەوەش بڵێم كە ئەو هێرشكردنەی كڵێسا تەنیا بـۆ سەر لـیـۆنـاردۆ نـەبـوو. بـگـرە دژایـەتـیـكـردنـی كـڵـێسا بـۆ سەرجەم نـوێخـوازان و ریفۆرمخوازانی سەردەمی ڕێنیسانس بوو(١٠١).

بە هۆی ئەو تۆمەتانەوە لیۆناردۆ بیر لەوە دەكاتەوە بچێتە لای شا (فرەنسیسی یەكەم) لە فرەنسا، لەبەرئەوەی پادشای فرەنسا كە لە پۆڵۆنیا لیۆناردۆی بینیبوو زۆر بە دڵی بوو. چەند جاریش نوێنەرەكانی پادشای فرەنسا كە لیۆناردۆیان دەبینی بانگهێشتنی فرەنسایان دەكرد كە زۆر بەڕێزەوە دەتوانێت لە سێبەری پادشای فرەنسا ژیان بەسەرببات.



بەشێك لە هێڵكاری و تێبینیی (لیۆناردۆ) لەسەر (كەللەی سەری مرۆڤ)، ١٤٨٩، قەڵەم جاف، ١٩×١٣,٧، ویندسۆر كتێبخانەی شاهانە

(١٠١) (دافنشی/ص٤١).

هێڵكاریی توێكاری و تێبینی لەسەر گرینگترین (ئۆرگان و سیستەمی لەشی ئافرەت)، ١٥٠٧، قەڵەم جاف لەسەر تەباشیری ڕەش لەسەر كاغەزی قاوەیی، ٤٧,٦×٣٣,٢سم، ویندسۆر - كتێبخانەی شاهانە. (لیۆناردۆ داڤنشی)

لێكۆڵینەوە بە وێنە و باسكردن لەسەر كۆرپەلە. (لیۆناردۆ داڤنشی)

هێڵكاری و كۆمەڵێك تێبینیی توێكاری لەسەر (كۆرپەلەی ناو مندالدان)، ١٥١٠-١٥١٢، قەڵەمی جافی قاوەیی، ٣٠,٤×٢٢سم، ویندسۆر - كتێبخانەی شاهانە. (لیۆناردۆ داڤنشی)

هێڵكاری و تێبینی لەسەر توێكاریی (شانی مرۆڤ)، ١٥١٠، قەڵەم و جاف لەسەر تەباشیری ڕەش، ٢٩,٢×١٩,٨سم، ویندسۆر كتێبخانەی شاهانە. (لیۆناردۆ داڤنشی)

بەشی چوارەم

## لیۆناردۆ دەچێتە فەرەنسا و لەوێ کۆتا بە ژیانی دێت

لیۆناردۆ لە نێوان ساڵانی (١٥١٥ و ١٥١٦) لەسەر بانگهێشتنی شا فەرەنسیسی یەکەم دەچێتە فەرەنسا. بەو شێوەیە رۆژە سست و درێژەکانی ژیانی لیۆناردۆ داڤنشی نزیکی ئاوابوون دەبێت، بۆیە لیۆناردۆی بلیمەت بەیارمەتیی قوتابیی دڵسۆزی (فرانچیسکۆ میلزی) بە نووسین و نیگارەکانی دادەچێتەوە و رێکیان دەخات ئەوەش وەکو پێشەکییەك بۆ کۆکردنەوەی سەرجەم لێکۆڵینەوەکانی لە یەك بەرگدا کە پێك هاتبێت لە زانیارییە کۆن، ناوەندی، نوێیەکانی. لێرەدا لیۆناردۆ خۆی ئامادە دەکرد بۆ نووسینەوەی بازنەی زانیاریی مرۆڤ.

لیۆناردۆ لە ناوچەی (ئەمبۆزا)ی فەرەنسایی لە خەڵوەتدا ژیانی بەسەر دەبرد، لە یادگاریەکانیدا نووسیبووی: "ئەو ژیانەی کە دەزانم بەسەری ببەم ژیانێکی درێژە".

ئەگەر تێبینیی یاداشتەکانی لیۆناردۆ بکەین لە دەستنووسەکانی وا پێ دەچێت کە لیۆناردۆ ئاگەداری بەرهەمی زانا ئیسلامەکان بووبێ لەوانە (رازی و ئیبن سینا)[١٠٢].

پاشان لیۆناردۆ لە ساڵی **١٥١٦** لە تەمەنی شەست و چوار ساڵیدا پۆرترێتێکی خۆی دروستدەکات، ئەوەش تاقە پۆرترێتی لیۆناردۆیە کە بە یەك رەنگ دروستی کردبوو، لە رێگەی ئەو وێنەیەدا خۆی پێشکێشی جیهان دەکات. لەو پۆرترێتەدا رووی خۆی بە ریشێکی درێژ و دەربڕینێکی بێزار کێشاوە، کە ئەوەش لە سەردەمی رێنیسانسدا هێمای زیرەکییەکی قووڵی دەردەبڕی.

لیۆناردۆ لە ساڵەکانی کۆتاییی ژیانیدا نووسیبووی: ئێمە زۆرجاران هیوامان بە داهاتووە، بەڵام داهاتوو تەنیا مردن و لەناوچوونی هیواکانمان بۆ کۆ دەکاتەوە.

---

(١٠٢) (مەزهەر/ل ٩٩).

لیۆناردۆ لە ساڵی ١٥١٨ پاش ئەوەی تەندروستیی زۆر خراپ دەبێت، دەستی ڕاستەی لە کار دەکەوێت، ئەو کاتی تەنیا بە دەستی چەپی لێکۆڵینەوە و نووسین و هێڵکاریەکانی ئەنجام دەدا. لیۆناردۆ هونەرمەندێکی زۆر بلیمەت بوو و زانایەکی داهێنەریش بووە لە زۆربەی زۆری بوارە زانستییەکان کە لەو سەردەمیدا کەسانی تر بیریان بۆ ئەو شتانە نەچووە کە لیۆناردۆ بیری بۆ چووە. ئەگەر تێبینیی نووسین و دەربڕین و بۆچوونەکانی لیۆناردۆ بکەین لە کتێبەکەی لەبارەی وێنەکێشان (ئۆڕبینۆ)وە ئەوەمان بۆ بەدەردەکەوێت کەوا ئاستی زانیاری و ڕۆشنبیریی لیۆناردۆ لووتکەی تێگەیشتنی لەبارەی هونەرەکان و زانستەکان و ژیان بە گشتی هەبووە، لە کتێبەکەیدا لە زۆر ڕووەوە باسی زۆر شتی کردووە، بەڵام هەرگاف پایەی هونەری شێوەکاری لە سەرجەم هونەرەکان و تەنانەت زانستەکانیش بە بەرزتر ڕاگرتووە، لەبەرئەوەی لەلای لیۆناردۆ هونەری وێنەکێشان وەکو زانست نییە کە بتوانرێت بگوازرێتەوە، لیۆناردۆ نموونە دەهێنێتەوە و دەڵێت: زانست دەتوانرێت بگوازرێتەوە، قوتابی ئەگەر زانست بە باشی وەربگرێت، ئەوا لەوانەیە وەکو مامۆستاکەی لێ بێت، لێرەدا دەتوانرێت شوێنکەوتە وەکو داهێنەرە بنچینەکەی زانست بێت. واتە بگاتە ئەنجامی تەواوی وەکو ئەنجامە بنچینەییەکە، ئەو زانستە بەسوودە بۆ ئەوانەی لایەنی لاساییکردنەوەیان گرتووەتە بەر، بەڵام وێنەکێشان وەکو زانستەکانی تر نییە بە میراتی بمێنێتەوە. بۆیە ئەو کەسەی کە سروشت ئامادەی نەکردبێت ناتوانێت وێنەکێشانی فێر بکەیت، بۆ نموونە وێنەکێشان پێچەوانەی زانستی ماتماتیکە، لەبەرئەوەی قوتابی لەو زانستە دەتوانێت لەگەڵ مامۆستاکەی هاوسەنگ بێت(١٠٣).

لیۆناردۆ پێی وایە ئەدەبیش تیراژە لەبەرگیراوەکەی هەمان بەهای تیراژی ڕەسەنی هەیە. لەو گۆشەیەوە پەیکەریش ئەو جیاوازییەی لێوە بەدی دەکرێت لەبەرئەوەی دەتوانرێت قاڵب لەبەر تیراژە ڕەسەنەکەی دروست بکرێت و شێوەیەکی هەمان شێوەی ڕەسەنی لێوە بێتە ئارا و هەمان بەهاشی هەبێت.

بۆیە وێنە لەبەری ناگیرێتەوە و ناتوانرێت ژمارەی زۆری لێوە دروست بکرێت، لێرەدا وێنە تاکە زانستە کە پارێزگاری لە بەهای مەزنی خۆی کردووە. تەنیا وێنەکێشانە شکۆداری بۆ داهێنەرەکەی دروست دەکات و پارێزگاری لە تاکایەتیی بەهایەکەی دەکات.

---

(١٠٣) (دافنشی/ص٤٧ – ٤٨).

(ڤالێری) پێی وایە کە لیۆناردۆ هونەری بە شێوەیەکی زانست دادەنا، لەبەرئەوەی هونەر تەنیا خەیاڵ نییە کە لە سنووری کەتوار دەرچووبێت. دەتوانم بڵێم لیۆناردۆ هەموو کات پارێزگاریی لە ئیستاتیکای بینین کردووە، لێرەشدا ویستوویوتی جووڵە بداتە فیگەرەکانی نێو کارە هونەرییەکانی(١٠٤).

لیۆناردۆ دەیگوت هەردەم وێنە وا بکێشە کە رووی سینگ و سەرك یەك ئاراستەیان نەبێت(١٠٥).

ئەوەش بە بەڵگەی ئەوەی کە لیۆناردۆ پێشتر لە زۆر تێکست و تێبینییەکانی خۆی لەسەر بەزانستبوونی هونەر شتی زۆری نووسیبووەوە. بۆ نموونە لیۆناردۆ دەیگوت: وێنە لەسەر ئەم زانستانە دەوەستێت (لێڵی، رووناکی، بریقە، مەتریال، رەنگ، شێوە، بارودۆخ، نزیکی، دووری، جووڵە و پشوو). ئەمانە توخمە سەرەکییەکانی وێنەکێشان بوون لەلای لیۆناردۆ.

---

(١٠٤) (بهنسی/ ص١٣٠).

(١٠٥) (دیورانت/ ص٢٥٥).



پۆرترێتی (لیۆناردۆ داڤنشی) بە پیری لە تەمەنی شەست و چوار ساڵیدا، ١٥١٦،
٣٣,٢×٢١,٢سم، ئیتاڵیا ـ تورینۆ. (لیۆناردۆ داڤنشی)


قەڵای (کلۆ) لە ناوچەی ئەمبۆزای فرەنسایی


ژووری نووستنی (لیۆناردۆ داڤنشی) لە قەڵای (کلۆ)ی ناوچەی ئەمبۆزا لە فرەنسا


ژووری دانیشتن و وێنەکێشانی (لیۆناردۆ داڤنشی) لە قەڵای (کلۆ)ی ناوچەی
ئەمبۆزا لە فرەنسا، کە لیۆناردۆ دواین ساڵەکانی تەمەنی خۆی تێدا بەسەر برد

## وام زانی فێر دەبم چۆن بژیم، بەڵام فێر دەبووم چۆن بمرم

"وام زانی فێر دەبم چۆن بژیم، بەڵام فێر دەبووم چۆن بمرم". ئەمە وشەکانی هونەرمەندی بلیمەت لیۆناردۆ داڤنشییە کە لە ژیاندا بوو، ئەو کاتەی کە هەستی بەوە دەکرد لە کۆتاییی ژیانی نزیك بووەتەوە(١٠٦).

لە ٢٣ی ئەپریلی ١٥١٩ لیۆناردۆ بە زووترین کات باوەڕپێکراو (جۆلیلمۆیبۆر)ی لەگەڵ چەند پیاوێکی ئاینی لە هاوڕێکانی بانگ کرد بۆ ئەوەی دوایین راسپاردەکانی ژیانی خۆی پێیان بڵێت. بەپێی راسپاردەکەی لیۆناردۆ هەموو کتێب و کەرەستە زانستییەکانی، توێژینەوە، کاغەز، تابلۆ و کەرەستە هونەرییەکانی بۆ هونەرمەند (میلزی) دەبێت لەبەرئەوەی وەکو کوڕی خۆی سەیری دەکرد. هەر لە هەمان کاتیشدا لە راسپاردەکەی لیۆناردۆ هاتبوو کەوا نیوەی ئەو باخچەیەی کە لە میلانۆ هەیبوو دەبێت بۆ (سالای) شوێنکەوتەکەی بێت، بۆ خزمەتکارە بەتەمەنەکەشی هەندێك پارە و جلوبەرگی بەجێ هێشت، برە پارەیەکیشی جێ هێشت بۆ ئەوەی میلزی بیدات بە شەست کەسی هەژار(١٠٧).

لیۆناردۆ لە تەمەنی شەست و حەفتساڵیدا لە ٢ی مەی ١٥١٩ پاش نۆ ڕۆژ لە نووسینەوەی راسپاردەکەی لە نێوان دەستی هونەرمەند (میلزی)ی قوتابی و دڵسۆز و هاوڕێی دەمرێت. کە پاشان میلزی و ژمارەیەکی کەم لە خزمەتکارەکانی بەرێیان کرد.

بەو شێوەیە لیۆناردۆ لەگەڵ شکۆدارییە مەزنەکانی دەڕوات. کە سیمبولی پیاوێکی تەواوی سەدەی پازدە بوو، هەتا سەدەی بیستەم و بیست و یەکەمیش. شاکارەکانی لیۆناردۆ تابلۆی (مۆنالیزا)، (دوایین شەوچەرە) و تابلۆیە بەناوبانگەکەی (پاکیزەی ناو تاشەبەردان) بوو کە تاوەکو ئێستاش توێژەران لە نهێنییەکانیان دەکۆڵنەوە، بەڵام لەبارەی کارە داتاشینەکانییەوە جگە لە پەیکەری (سوارچاك) لە وندسۆر و هەندێك کاری تری داتاشین هیچ کاری تری داتاشینی نەماون(١٠٨).

---

(١٠٦) (علی/ ص١).

(١٠٧) (دافنشی/ص٤٣).

(١٠٨) (الصراف/ص١٢٠ – ١٢١).

دەتوانین بڵێین قۆناغەکانی ژیانی لیۆناردۆ بە شێوەیەکی گشتی دابەشی سەر چوار سەردەمی سەرەکی دەبێت، وەکو ساڵانی راهێنانی لە فلۆرانسا کە لەساڵی (١٤٥٢ تا ١٤٨١). پاشان سەردەمی میلانۆ لە ساڵی (١٤٨٢ تا ١٥٠٠). سەردەمی پێگەیشتنیش لە ساڵی (١٥٠١ تا ١٥١٦)ە، بەڵام دواین قۆناغی لیۆناردۆ لە فەرەنسایە کە لە نێوان ساڵانی (١٥١٥ و ١٥١٦ تا ١٥١٩)یە.

هەردوو قوتابییەکەی لیۆناردۆ (میلزی) و (سالای) هەر لەگەڵ مامۆستاکەیان دەمێننەوە هەتا ئەو کاتەشی کە لیۆناردۆ دەچێتە فەرەنسا لەگەڵی دەڕۆن، تا دواساتی مردنیشی هەر لەگەڵی دەمێننەوە و لەسەر راسپاردەشی لە ١٢ی ئۆگست بەسەرپەرشتیی میلزی تەرمی لیۆناردۆ دەگوازرێتەوە بۆ ئیتاڵیا(١٠٩).

---

(١٠٩) (دافنشی/٢٨).

بەشی پێنجەم

## دەستنووس و تابلۆ و ئامێرە زانستییەکانی لیۆناردۆ بەو شێوەیە پەرت بوون

لیۆناردۆ لە قەڵای (کلۆ) لە فرەنسا پاش مردنی لە ساڵی ١٥١٩ ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ئامێری زانستی، تابلۆ و کەرەستەی هونەریی جێ هێشت، ئەوە جگە لەو ژمارە زۆرە کاغەزانەی کە لیۆناردۆ بیر و بۆچوون و تێبینی و وێنە و ژماردنیانی تێدا نووسیبووەوە، ئەو کاغەزانە کۆمەڵێك ناوی لێ نرابوو لەبەرئەوەی ئەو کاغەزانە ناوبانگ و گرینگییەکی زۆر و شوێنێکی تایبەتی لە مێژووی هونەر و ئەدەب و زانست گرتووەتەوە[١١٠].

ژمارەی کاغەزە پارێزراوەکانی لیۆناردۆ تاوەکو ئێستا حەفت هەزار کاغەزی قەوارە گەورەیە. بەڵام توێژەرەکان وای بۆ دەچن کە ئەو رێژەیە نیوەی ئەو کاغەزانەیە کە لیۆناردۆ لە کاتی مردنی بۆ (میلزی)ی قوتابی بەجێ هێشتبێت. بۆیە ئەگەر بۆچوونی ئەو توێژەرانە راست بێت ئەوا دەبێت لیۆناردۆ نزیکەی چواردە هەزار کاغەزی نووسیبێتەوە کە لە تەمەنی هەژدە ساڵی واتە لە ساڵی ١٤٧٠وە تاوەکو رۆژی مردنی لە ساڵی ١٥١٩ لیۆناردۆ بەردەوام بوو لە نووسین، کە دەکاتە نزیکەی پەنجا ساڵی تەمەنی. لێرەدا توێژەرەکان پێیان وایە کە لیۆناردۆ لە سی ساڵی کۆتای ژیانیدا باشترین نووسینەکانی نووسیوە. بەڵام بۆچوونێکی تر پێی وایە کە لیۆناردۆ پێنج هەزار لاپەڕەی نووسیوە، بەڵام کتێبێکی پێ تەواو نەکراوە، بۆیە بەم شێوەیە لیۆناردۆ لەلایەنی ژمارەوە نووسەر بووە زیاتر لەوەی هونەرمەند بێت[١١١].

(میلزی) یەکەمین کەس بوو کە دەستنووس و کاغەزە بەجێماوەکانی لیۆناردۆی لە

(١١٠) (دافنشی/ ص١٣).

(١١١) (دیورانت/ ص٢٥٥).

چەند بەرگێك پۆلێن كردووە، بەڵام پاش مردنی میلزی لە ساڵی ١٥٧٠ هەندێك لە كاغەزە دەستنووسەكانی لیۆناردۆ بزر دەبن و تێك دەچن، هەندێكیش لە كاغەزەكان دەگوازرێنەوە بۆ وڵاتانی تری ئەوروپایی و هەندێكیشیان دەگوازرێنەوە بۆ ئەمەریكا. توێژەران لە ئەنجامی توێژینەوەیان لەسەر دەستنووسە رەسەنەكانی لیۆناردۆ گەیشتنە ئەو ئەنجامەی كە لیۆناردۆ لە دواساڵانی ژیانیدا دەیویست سێ كتێبی جیا بنووسێتەوە كە (كتێبی وێنەكێشان) و (كتێبی میكانیك) و (كتێبی توێكاری) بوون. بەڵام هەردوو كتێبی (توێكاری و میكانیك) تاوەكو ئێستا نەدۆزراونەتەوە، تەنیا هەندێك برگەی جیاجیا نەبێت لە دەستنووسە رەسەنەكانی لیۆناردۆ كە ئێستا ماون. بەڵام كتێبی وێنەكێشان یان پەیامی وێنەكێشان (ئۆربینۆ) وەكو كە پێی ناسراوە تا ماوەیەكی زۆر لە كتێبخانەی (ڤاتیكان) بە لەبیركراوی هەڵگیرابوو تاوەكو رۆشنبیرێك بە ناوی (جۆلیلمۆ مانزی) دۆزییەوە كە لە ساڵی ١٨١٧ بۆ یەكەمین جار سەرپەرشتیی لە چاپدانی كرد. پەرتبوونی دەستنووسەكانی لیۆناردۆ لە ساڵی ١٦١٠ەوە دەست پێ دەكات بە هۆی ئەوەی بنەماڵەی میلزی پاش مردنی میلزی دەستنووسەكانی لیۆناردۆ فەرامۆش دەكەن. ئەمەش چەند روونكردنەوەیەكە لەو بارەیەوە:

لە ساڵی ١٦١٠دا دوو بەرگ لە دەستنووسە كۆكراوەكانی لیۆناردۆ لە میلانۆ بردرایە ئیسپانیا. لە ساڵی ١٦٣٦یشدا بنەماڵەی میلزی دوازدە بەرگیان لە دەستنووسە كۆكراوەكانی لیۆناردۆ پێشكێشی كتێبخانەی (ئەمبرۆزیانا) كرد لە میلانۆ، بە شێوەیەك لە شێوەكانیش ئەو كتێبخانەیە دوو بەرگی تریشی دەست كەوت، بۆیە بووە خاوەنی چواردە بەرگ. پاشان لە ساڵی ١٦٧٤ بەرگێكی تریشی دەست كەوت. بەڵام لە هەمان ساڵیشدا دوو بەرگی لێ بزر بوو و سێزدە بەرگی مایەوە. پاش داگیركردنی ئیتاڵیا لەلایەن ناپلیۆنەوە لە ساڵی ١٧٩٧ بەرگی (ئەتلەنتی) گواسترایەوە بۆ كتێبخانەی نیشتمانی لە پاریس، ئەو دوازدە بەرگەی تریش كە مابوون گواسترانەوە بۆ پەیمانگەی فرەنسایی لە پاریس. بەڵام لە ساڵی ١٨١٠ كتێبخانەی ئەمبرۆزیانا توانی بەرگی (ئەتلەنتی) بگەڕێنێتەوە.

پاشان دەستنووسە كۆكراوەكانی لیۆناردۆ بۆ زۆر شوێن گوازرانەوە وەكو ڤیەننا، مۆزەخانەی ڤیكتۆریا و ئەلبرت لە لەندەن و چەندین شوێنی تریش. پاشان پەڕەكانی لێ كرانەوە و فرۆشران تا بەشێكیان گەیشتنە ئەمەریكا.

لە ساڵی ١٨١٧شدا بەرگی تیراژە کۆکراوە رەسەنەکەی میلزی لەلایەن (جۆلیلمۆ مانزی) دۆزرایەوە لە کتێبخانەی (ئۆربینۆ)، کە ئەو تیراژە کۆکراوەی چەند دەستنووسێکی لیۆناردۆیە لە یەك بەرگدا کە بە (بەرگی ئۆربینۆ CODEX URBINAS LATINUS 1270 – ١٢٧٠ ) دەناسرێت. توێژەران مێژووی یەکەم چاپی ئەو بەرگە بۆ ناوەڕاستی سەدەی شازدە دەگەڕێننەوە، کە بە سەرپەرشتیی (میلزی)یەوە کۆ کراوەتەوە و بە چاپ گەیێنراوە، میلزی لە زۆربەی شوێنە لاچووەکانی تێکستە رەسەنەکە ئیمزای خۆی داناوە. میلزی بۆ کۆکردنەوەی ئەو دەستنووسانەی لیۆناردۆ کە پێوەندیی بە هونەری وێنەکێشانەوە هەبوو جواننووسێکی بەکرێ گرت، جواننووسەکەش بۆ نووسینەوەی ئەو دەستنووسانەی لیۆناردۆ ئاوێنەیەکی بەکار هێنا لەبەرئەوەی لیۆناردۆ بە سەراوژێری و بە پێچەوانە واتە لەلای راستەوە بۆ چەپ تێبینی و تێکستەکانی دەنووسییەوە، جواننووسەکە لە دواین پەڕی کتێبەکەشدا ئیمزای خۆی و تێبینیی ئەوەی نووسییەوە کە راستەوخۆ تێکستەکانی لە دەستنووسەکانی لیۆناردۆوە گواستووەتەوە. بەڵام ئیتاڵیاییەکان ناوی (پەیامی وێنەکێشان)یان بۆ کتێبەکە داناوە.

کتێبی ئۆربینۆ یان پەیامی وێنەکێشان یان لەبارەی وێنەکێشانەوە، یان تیۆری وێنەکێشان کە پاشان چاپی یەکەمی وەکو لە پێشتریشدا ئاماژەم پێ کرد بە سەرپەرشتیی (جۆلیلمۆ مانزی) بە چاپ گەیێندرا.

دەستنووسی بەرگەکانی لیۆناردۆ بە زۆر شێوە لە دەزگا و وڵاتی جیاجیادا بەچاپ گەیێندران و وەرگێڕدرانە سەر زمانە جیاجیاکان و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرا، بە تایبەتی چاپی ئەڵمانیاییەکەی کە ئێستا بەگرینگترین سەرچاوەی تیراژی کتێبی (پەیامی وێنەکێشان) دادەنرێت. لە ساڵی ١٨٨٣شدا دوو بەرگ بە چاپی ئینگلیزی کە پێکهاتبوو لە کۆکردنەوەی دەستنووسە رەسەنەکانی لیۆناردۆ و بە ناوی (کارە ئەدەبییەکانی لیۆناردۆ داڤنشی)یەوە چاپ کران. لە ساڵی ١٨٩٠یشدا تیراژی دووەمی رۆمای کتێبی (پەیامی وێنەکێشان) بەچاپ گەیێندرا.

لە ساڵی ١٩٣٥ (هێڵکارییەکانی لیۆناردۆ) لەلایەن لێکۆڵەر (جۆزبینا فۆما جالی) بڵاو کرایەوە. تاوەکو ئێستاش لێکۆڵینەوە و وەرگێڕان و گوتار لەسەر کارەکانی لیۆناردۆ بەردەوامە، کەچی تاوەکو ئێستا سەرجەم کارەکانی لیۆناردۆ بە شێوەیەکی

تەواو بە چاپ نەگەیێندراون. سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و کۆششانەی کەوا تاوەکو ئێستا خراونەتە گەڕ لەلایەن توێژەر و دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە و زانکۆ و پەیمانگە زانستی و هونەرییەکان بۆ لە چاپدانی دەستنووسەکانی هونەرمەند و زانای بلیمەت لیۆناردۆ داڤنشی، بەڵام تاوەکو ئێستا زۆر لە دەستنووسەکانی لیۆناردۆ لێرە و لەوێدا شاردراونەتەوە، یان لەنێو زانکۆ و پەیمانگە و مۆزەخانەکاندا چاپکردنیان قەدەغە کراوە. بۆ لە چاپدانی سەرجەم ئەو دەستنووسانەی لیۆناردۆ کە ئێستا لەلای چەند لایەنێکەوە هەڵگیراون و پارێزگاریان لێ دەکرێت، پێویستە سەرجەم ئەو لایەنانە بۆ لە چاپدانی تێکرای دەستنووس و کارەکانی لیۆناردۆ رێك بکەون:

– پەیمانگای فرەنسایی لە پاریس یازدە بەرگی لەلایە، کە بەم شێوەیە پۆلێن کراوە (A. B. C. D. E. F. G. H. I. L. M) کە دەکاتە دەستنووسی ژمارە (٢٠٣٧ و ٢٠٣٨).

– کتێبخانەی قەڵا لە میلانۆ دەستنووسێکی لیۆناردۆی بە ناوی (تریفولسانۆ)ی لەلایە.

– مۆزەخانەی بەریتانیایی لە لەندەن دەستنووسی لیۆناردۆی بە ناوی (ئەراندۆل)ی لەلایە.

– سێ دەستنووسی لیۆناردۆ بە ناوی (فۆرستەر) لە مۆزەخانەی ڤیکتۆریا و ئەلبێرتە.

– دەستنووسێك بە ناوی (فڕینی باڵندە) لەگەڵ چەند کاغەزێکی جیاجیای لیۆناردۆ لە کتێبخانەی نیشتمانییە لە تۆرینتۆ.

– چەند کاغەزێکی جیاجیای لیۆناردۆ بە ناوی (کاغەزەکانی وندسۆر) کە برێتییە لە لێکۆڵینەوە لەسەر (توێکاری) لە کتێبخانەی شاهانەی وندسۆرە.

– دەستنووسێکی لیۆناردۆ بە ناوی (دەستنووسی لیستەر) لە کتێبخانەی لیستەرە لە نۆرفۆك.

– دوو کاغەزی جیاوازی لیۆناردۆ لە مۆزەخانەی ئۆڤیزیە لە فلۆرانسا.

– پێنج کاغەزی جیاوازی لیۆناردۆ لە ئەکادیمیای هونەرە لە ڤینیسیا.

– یەك کاغەزی لیۆناردۆ لە مۆزەخانەی لۆڤەرە لە پاریس.

– یەك كاغەزی لیۆناردۆ لە مۆزەخانەی میترۆپۆلیتانە لە نیویۆرك.

بۆیە بۆ تێگەیشتنی تەواو لە بیر و بۆچوون و تیۆرەكانی لیۆناردۆ داڤنشی لەسەر هونەر و زانست دەبێت ئەو دەزگایانە رۆڵێكی مەزن بگێڕن و هەوڵەكانی خۆشیان بەگەڕ بخەن تا ئامانجی خزمەتكردنی مرۆڤایەتییان هەبێت(112)، لەبەرئەوەی لیۆناردۆ داڤنشی بە هۆی بلیمەتییە بێ سنوورییەكەی تەنیا گەنجینەی میللەتێك یان وڵاتێك نەبوو، بگرە لیۆناردۆی بلیمەت گەنجینەی سەرجەم مرۆڤایەتییە. ئەمەش بە هۆی ئەوەی كە كاریگەری بەسەر سەرجەم مرۆڤایەتییەوە هەبووە.

بۆیە لەسەر پێشنیازی ئەنجوومەنی ئاسایشی جیهان لە مانگی نیسانی ساڵی **١٩٥٢دا** چەند دەزگایەكی رۆشنبیریی جیهانی بە بۆنەی تێپەڕبوونی پێنجسەد ساڵ بەسەر لەدایكبوونی هونەرمەندی داهێنەر و زانای گەورە لیۆناردۆ داڤنشییەوە ئاهەنگیان گێڕا(113).

لیۆناردۆ مەزنترین زانا و ئەندازیار، یان وێنەكێش یان پەیكەرتاش، یان هزرمەندی سەردەمەكەی نەبوو، بگرە تەنیا مرۆڤێك بوو كە هەموو ئەو كەسانەی لێ كۆ ببووەوە، كێبەركێی لەگەڵ مەزنترین ئەو كەسانەش دەكرد كە خەریكی ئەو بوارانە بوون(114).

لیۆناردۆ لە ژیانیدا خەونی بێ سنووری هەبوو، لەبەرئەوەی مرۆڤی تر توانای سنووردار بوو، بۆیە ئەوەیە شكۆیە مەزنەكەی. لیۆناردۆ زۆر لە كارەكانی پێ تەواو نەكرا و هەندێكیشیان بزر بوون، ئەوەش بوو كارەساتە مەزنەكەی.

---

(١١٢) (دافنشی/ ص١٦).

(١١٣) (مەزهەر/ل ٩٧).

(١١٤) (دیورانت/ ص٢٦٥).

## هەندێك وێنەی نموونەیی

تیۆر و کارە هونەرییەکانی لیۆرناردۆ داڤنشی لەسەر هونەر و زانست لێرە دابنرێ لە لاپەڕەیەکی سەربەخۆ



تابلۆی (فرۆنییێری)، مۆزەخانەی لۆڤەر. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی شەڕوانێکی کۆن (داریوس). (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵكاری لەسەر (شێوازی ڕێكخستنی پرچی ئافرەتان)، ١٦ × ٢٠سم، ویندسۆر ـ كتێبخانەی شاهانە. (لیۆناردۆ داڤنشی)



بەشێك لە هێڵكارییەكەی (شێوازی ڕێكخستنی پرچی ئافرەتان). (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی (ئانای پیرۆز)
(لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی (فلیپی پیرۆز)، ١٤٩٦.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی سەرەکیی (شەڕوانێک)،
١٨,٦×٢٢,٧سم، مۆزەخانەی نیشتمانی -
بودابست. (لیۆناردۆ داڤنشی)



سکێچ و لێکۆڵینەوە لەسەر (پاکیزە و عیسا
پێغەمبەر)، مۆزەخانەی ویندسۆر.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



گۆڕەپانێك بۆ ئامادەكردنی (چەكێكی مەزن)، ١٤٨٧. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی (پشیلە و ئەژدیها)، ١٥٠٦، ٢٧×٢١سم، ویندسۆر ـ کتێبخانەی شاهانە.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکارییەکی لێکۆڵینەوەییی (جەرجیسی پیرۆز و ئەژدیها)، ١٥٠٧ ـ ١٥٠٨، مۆزەخانەی ویندسۆر. (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکارییەك بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر (لێشاوی ئاو)، ١٥١٣، قەڵەم، فلۆرانسا.  (لیۆناردۆ داڤنشی)



(شێوەیەك لە لافاوی نوح)، ١٥١٥، تەباشیری ڕەش و مەرەكەبی قاوەیی و زەرد، فلۆرانسا.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



بەشێك لە هێڵكاریی سەری (ئاژەڵێكی ئەفسانەیی). (لیۆناردۆ داڤنشی)



هێڵکاریی جۆره دارێك به ناوی (بیۆرگ)، ١٤٩٤ ـ ١٤٩٥، تەباشیری سۆر، ئۆکسفۆرد.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



کاریگەری رووناکی لەسەر ڕووی پیاوێك، ١٤٨٧ ـ١٤٩٠، فلۆرانسا.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



سکێچ و تێبینی لەسەر (ئەسپسوار).  (لیۆناردۆ داڤنشی)




(ئەستێرەی بەیت لەحم و ڕووەك)، ١٥٠٥ ـ ١٥٠٨، تەباشیری سوّر و قەڵەم و مەرەکەب،
١٩,٨× ١٦سم، ویندسوّر ـ کتێبخانەی شاهانە.  (لیوّناردوّ داڤنشی)





وێنەی هەندێك هێڵكاری و تێبینیی زانستی لەسەر توێكاریی كەللەی سەری (مرۆڤ).
(لیۆناردۆ داڤنشی)



وێنەی هێڵکاری و تێبینیی زانستی لەسەر توێکاریی چاوی (مرۆڤ).  (لیۆناردۆ داڤنشی)







وێنەی هەندێك هێڵكاری و تێبینیی زانستی لەسەر توێكاریی كەللەی سەری (مرۆڤ).

(لیۆناردۆ داڤنشی)





وێنەی هێڵکاری و تێبینیی (لیۆناردۆ داڤنشی) لەسەر (توێکاریی لەشی مرۆڤ).



وێنەی هەندێك لەو هێڵكاری و تێبینییانەی (لیۆناردۆ داڤنشی)
لەسەر توێكاریی (لەشی مرۆڤ).



وێنەی هەندێك لەو هێڵكاری و تێبینییانەی (لیۆناردۆ داڤنشی) لەسەر
(ماسولكەكانی لەشی مرۆڤ).





وێنە و تێبینیی زانستی لەسەر توێکاریی ماسولکەکانی (مرۆڤ).   (لیۆناردۆ داڤنشی)





وێنەی هێڵکاری و تێبینیی زانستیی (لیۆناردۆ داڤنشی)
لەسەر هەندێك لە ئێسکەکانی (مرۆڤ).



وێنەی هێڵکاری و تێبینیی زانستی لەسەر ئێسکەکانی (دەست و قۆڵی مرۆڤ).

(لیۆناردۆ داڤنشی)



وێنەی هێڵکاری و تێبینی لەسەر ئێسکەکانی (پێ و لاق و ڕانی مرۆڤ...). (لیۆناردۆ داڤنشی)



وێنەی هێڵکاری وتێبینی لەسەر (ئێسکەکانی دەستی مرۆڤ...). (لیۆناردۆ داڤنشی)



لێکۆڵینەوەیەکی توێکاری بە نووسین و هێڵکاری لەسەر (دڵ و لوولەکانی خوێنی مرۆڤ).

(لیۆناردۆ داڤنشی)





لێکۆڵینەوەی توێکاری بە نووسین و هێڵکاری لەسەر (دڵی مرۆڤ).
(لیۆناردۆ داڤنشی)



وێنەی لێکۆڵینەوە بە تێبینی و هێڵکارییەوە لەسەر توێکاریی (دەمارە کۆئەندام).
(لیۆناردۆ داڤنشی)



چەند لێکۆڵینەوەیەکی توێکاری بە نووسین و هێڵکاری لەسەر (کۆئەندامی هەرس و کۆئەندامی میز) لە لەشی مرۆڤ... (لیۆناردۆ داڤنشی)



وێنەیەکی لێکۆڵینەوە بە نووسین و هێڵکاری لەسەر (دەم و ددانی مرۆڤ).
(لیۆناردۆ داڤنشی)



لێکۆڵینەوە بە نووسین و هێڵکاری لەسەر (بڕبڕەی پشتی مرۆڤ). (لیۆناردۆ داڤنشی)



دیزاینێك بۆ (مەكینەی فڕین)، ١٤٨٧، ٢٣,٥×١٧,٦سم، كاغەز، پەیمانگەی فرەنسایی.
(لیۆناردۆ داڤنشی)



(تانك یان گالیسكەیەكی داپۆشراو بۆ شەڕ) بە گوێرەی دیزاینێكی (لیۆناردۆ داڤنشی)یەوە
لەلایان زاناكانی ئەم سەردەمەوە دروست كراوە







دیزاینی هەندێك ئامێری زانستی. (لیۆناردۆ داڤنشی)





دیزاینی هەندێك ئامێری زانستی بە تێبینییەوە. (لیۆناردۆ داڤنشی)



(ترۆمپایەك بۆ ڕاكێشانی ئاو)، دیزاین و هێڵكاری بە تێبینییەوە. (لیۆناردۆ داڤنشی)

## سەرچاوەکان

١– دافنشي (ليوناردو دافنشي)، نظرية التصوير، ترجمة: عادل السيوي، مكتبة الاسرة، ١٩٩٩، مطابع الهيئة المصرية العامة للكتاب.
٢– فرويد (سيجموند)، ليوناردو داڤنشي، ترجمة: عبدالمنعم الحفني، المركز العربي للثقافة والعلوم، بيروت، لبنان، الطبعة الثالثة، ١٩٨٢.
٣– هان (املي)، ليوناردو دافنشي، ترجمة: محمد سيد محمد، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر بالقاهرة.
٤– ديورانت (ويل)، أبطال من التاريخ، ترجمة: سامي الكعكي – سمير كرم، دار الكتاب العربي، بيروت – لبنان.
٥– بيتر و ليندا (بيتر و ليندا موري)، فن عصر النهضة، ترجمة: فخري خليل، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، الطبعة الاولى، ٢٠٠٣.
٦– يوسف (احمد أحمد)، مشاهير الفنانين، ليوناردو دافنشي، دار المعارف بمصر.
٧– (الناجحون) ليوناردو دي فنشي – الرسام الخالد، دار العلم للملايين، بيروت، لبنان، الطبعة التاسعة، كانون الثاني (١٩٧٩)، مطابع اوفست كونرو غرافير– بيروت.
٨– مەزهەر (د. کەمال)، ڕێنیسانس، وەرگێڕانی: فوئاد مەجید میسری، بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان، چاپخانەی شڤان، چاپی دووەم، ٢٠٠٤.
٩– عطية (عبود)، جولة في عالم الفن، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، الطبعة الأولى (١٩٨٥).
١٠– علي (فاطمة)، ليوناردو داڤنشي، دار اخبار اليوم، قطاع الثقافة، الطبعة الثانية، طبع بمطابع دار اخبار اليوم.
١١– الصراف (امال حليم)، موجز في تاريخ الفن، مكتبة المجتمع العربي للنشر والتوزيع، عمان، الطبعة الاولى، ٢٠٠٤.
١٢– مراد (طارق)، موسوعة المدارس الفنية للرسم – الكلاسيكية وفنون عصر النهضة، دار الراتب الجامعية.
١٣– علام (نعمت إسماعيل)، فنون الغرب في العصور الوسطى والنهضة والباروك، دار المعارف بمصر، مطابع دار المعارف بمصر ١٩٧٦.
١٤– بهنسي (الدكتور/ عفيف)، علم الجمال عند ابي حيان التوحيدي ومسائل في

الفن، وزارة الاعلام، مديرية الثقافة العامة، السلسلة الفنية (١٨)، طبع مطابع ثنيان، بغداد ١٩٧٢.
١٥– حماد (د. حسن محمد حسن)، الاغتراب عند إيريك فروم، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت– الحمرا، الطبعة الاولى ١٩٩٥.
١٦– عثمان (حسن)، ساڤونارولا– الراهب الثائر، الكتاب للجميع – دار المدى للثقافة والنشر ٢٠١٠.
١٧– فونتانا (ديڤيد)، الشخصية والتربية، ترجمة: عبدالحميد يعقوب جبرائيل، د. صلاح محمد نوري داود، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، جامعة صلاح الدين، اربيل، مطابع التعليم العالي، اربيل، ١٩٨٩.
١٨– صالح (قاسم حسين)، الابداع في الفن، دار الرشيد للنشر ١٩٨١، منشورات وزارة الثقافة والاعلام – الجمهورية العراقية، سلسلة دراسات (٢٦٧)، دار الطليعة للطباعة والنشر – بيروت.

19. buchholz (Eike Linda), Leonardo da Vinci - Liv och verk, KöNEMANN 2005.
20. ARGAN & CONTARDI (GIULIO C.) & (BRUNO), Michelangelo, ART DOSSIER, n.9, gennaio 1987.